



# خۆری ئیسلام

گۆڤارێکی رۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزییە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەری دەکات

سالی چوارەم ژمارە ،١٣، جمادی دووەم ١٤٢٢ کۆچی / ئەیلول ٢٠٠١ ز





بەڕێز د . مەحمود عەبدولغەنی عاشور :

## من لە ئایندەی گەلی کورد و کێشەکەی دڵنیام چونکە لە دەستێکی ئەمیندایە .

بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی :

## بەخێر بێن بۆ هەرێمی کوردستان بۆ خاک و گەلی سەلاحەدینی ئەیوبی

# دانـــانــی بـــەردی بناغەی
# مزگـــەوتی حــاجــی ئـۆمـــەران ...

بسم الله الرحمن الرحيم

إنما يعمر مســاجد الله من آمن بالله واليوم الآخر وأقام الصلاة وآتى الزكاة ولم يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ فَعَسَــى أُوْلَئِكَ أَنْ يَكُونُوا مِــنْ الْمُهْتَدِينَ (١٨) ســورة التوبة.

صدق الله العظيم



**بەڕێزان ...**

**مامۆستایانی ئایینی خۆشەویست**

**خەڵکی شارۆچکەی حاجی ئۆمەرانی تێکۆشەر .**

جێگای سەرفرازی و شەرمەندییە بۆ من کە ئەمڕۆ بەردی بناغەی مزگــەوتی حــاجی ئۆمــەران دابنێم بەناوی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لە حکومــەتی هــەرێمی کوردســتان . شــارۆچکەی حــاجی ئۆمەران و خەڵکی بەشەرەفی ئەم دەڤەرە زیادە لەوەی کە بارەگای سەرکردەی میللەتی کورد بارزانی نەمری لــێ بووە مەزاری پیرۆزی شێخی باڵەکانی لێیە ، هەردەم مەڵبەندی شێران بــووە جێگــای تێکۆشــەرانی بەتوانای گەلەکەمان بووە قوربانی و تاڵی و سوێری زۆری چێشتووە بۆ وەدی هێنانی ئەم ڕۆژە ســەرفرازو ئازادیە بۆ گەلەکەمان ، لەبەر ئەوە هەرچەندە خزمەت بەم دەڤەرە بکرێت هەر کەمە ، وەکو وەفادارییەك بۆ گیانی بەرزە فڕی شەهیدە سەربەزەکانمان و دانیشتوانی ئەم شارۆچکەیە .

ئومێدەوارم ئەم مەڵبەندی خوداناسینە ببێتە جێگای پڕ بەدڵی خوداوەندی بــێ هاوتــا و مامۆســتایانی ئایینی بەقەدەر هەوڵ بدەن لەڕێگای مینبەرەکانیانــەوە کــە مینبــەری حــەزرەتی ( محمــد )ە د.خ خــەڵك ئامۆژگاری بکەن بۆ ڕەوشتی باش و گیانی برایــەتی و تــەبایی فــێری خــەڵك بکــەن ، وانــەی نیشــتمان پەروەرییان بۆ ڕوون بکەنەوە ، وەفەرموودەی پێغەمبەری سەردار ( د.خ ) جێبەجێ بکــەن کــە ئەفــەرموێت (بعثت لأتمم مكارم الأخلاق ) . بەشێوەیەك بتوانن ئایین پەروەری و نیشتمان پەروەری لێك گــری بــدەن .

دیارە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی کە ئەرکی خزمەت کردنی پیاوانی ئایینی و مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی کوردستانی لە ئەستۆدایە هــەرگیز درێغــی نــەکردووە ناکــا لــە خزمــەت کــردن بەخــەڵکی موسڵمانی حاجی ئۆمەران کە بۆ ماوەیەکی زۆر بارزانی نەمریان لەئامێز گرتبوو.

لەکۆتاییدا دەڵێم با گیانی بارزانی نەمر ئاسوودە بێت کە لەجێگای ئەو مزگەوتە کە ئەو زاتە مەزنــە بنیادی نابوو ، ئەم مزگەوتە تازەیە دروست دەکرێت .

سڵاو لە گیانی پاکی شەهیدانی کورد و کوردستان و سەرەوەریان بارزانی نەمر و کاکە ئیدریسی هەمیشــە لەیاد .

بەئومێدی پاشەڕۆژێکی بەختەوەرو ئاسوودەتر بۆ گەلەکەمان .

**والسلام عليكم ورحمة الله و بركاته**



گۆڤارێکی
رۆشنبیری
زانستی
ئیسلامی
وەرزییە
وەزارەتی
ئەوقاف و
کاروباری
ئیسلامی
دەری دەکات

# خۆری ئیسلام

# 13

سالی چوارەم


جمادی الثاني ١٤٢٢ كۆچی گەلاوێژی ٢٧٠١ ی کوردی

ئەیلولی ٢٠٠١ی زایینی


خاوەنی ئیمتیاز
**عەدنان نەقشبەندی**

سەرنووسەر
**خورشید شیرە**

جێگری سەرنووسەر
**سەلام کەریم سیدان**

بەڕێوەبەری نووسین
**مەلا عبداللطیف بامۆکی**

بەڕێوەبەری کارگێڕی
**قاسم رەسول بەرزنجی**

سکرتێری نووسین
**مەریوان مەحمود کاکە شێخ**


ناونیشان
هەولێر
دیوانی
وەزارەتی
ئەوقاف و
کاروباری
ئیسلامی
پۆستگەی
راگەیاندن
[illegible] ٤٦٧٧



پیت چنین: کۆمپیوتەری وەزارەت نەخشەسازی : کۆمپیوتەری دەریا فەرزی بەرگ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

# ناوەرۆك



بسم الله الرحمن الرحيم

وما تقدموا لأنفسكم من خير تجدوه عند الله هو خيرا وأعظم أجرا واستغفروا الله إن الله غفور رحيم

صدق الله العظيم

**بەناوی خودای گەورەو میهرەبان**

**ئەوەی پێش خۆتانی دەخەن لەچاکە کردن لای خودا بۆتان هەڵگیراوەو ئەوەش چاکەیەکی زۆرەو پاداشی گەورەی هەیە. داوای لێ بوردن تەنها لەخودا بکەن خودا لێ بوردەو دلۆڤانە**



عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ ٱللَّهِ ﷺ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي، قَالَ «قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ». مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

**سبل السلام ج١ ، لاپەڕە ٣٠٧**

## نزاو پارانەوە

**لە ئەبوبەكری سەدیقەوە ( خودای لیٚ رازی بیٚت ) دەگیٚرنەوە كە بە پیٚغەمبەری( د.خ ) وتووە فیٚری نزایەكم بكە كە خودا لەگوناهم خۆش ببیٚ، وە لەنویٚژدا بیخویٚنم، فەرمووی بلیٚ: ﴿ خودایە من ستەمم لەخۆم كردووە بەزۆری كەس توانای لیٚخۆشبوونی نییە تەنها تۆ نەبی، لای خۆت لیٚم خۆش ببە، وە بەزەییت بیٚتەوە پیٚما تۆ لیٚبوردەو دلۆڤانی ﴾**

---

عَنْ عَبْدِ ٱللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ قَالَ: «جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «إِنِّي لَا أَسْتَطِيعُ أَنْ آخُذَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْئاً، فَعَلِّمْنِي مَا يُجْزِئُنِي مِنْهُ، فَقَالَ: «قُلْ سُبْحَانَ ٱللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا ٱللَّهُ، وَٱللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ» رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ،

**سبل السلام ج١ ، لاپەڕە ٢٧٥**

## خویٚندنەوەی قورئان

**لە عەبدوڵلای كوڕی ئەوفاوە( خودای لیٚ رازی بیٚت ) دەگیٚرنەوە پیاویٚك هاتە خزمەت سەروەری خۆشەویست( د.خ ) و وتی لەقورئان هیچ نازانم هەندیٚكم فیٚر بكە كە ئەوەندەی قورئان خویٚندن خیٚرم پیٚ بگات، فەرمووی بلیٚ:**

**﴿ سبحان الله، الحمدلله، لا اله الا الله، الله اكبر،**

**لاحول ولاقوة الا بالله العلي العظيم ﴾**



# تۆماری پڕ
# لەسەروەری و شانازی

سەرنووسەر




لەسەرەتای وشیار بوونەوەو زیندووبوونەوەی سۆزی نەتەوایەتیو نیشتمانی، گەلی کورد مێژوویەکی پڕ لەسەروەریو شانازی بەخوێنی رۆڵەکانی خۆی نووسییەوەو پێویست نەبوو پاڵەوانی داستان و ئەفسانە بۆ مێژووی خۆی هەڵبەستێت، لەیەکەم رۆژی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی نەمر لە ١٦ی ئابی (١٩٤٦)ەوە رۆژانەو ساڵانە دەیان داستانی نەبەردیو قارەمانی رۆڵە پێشمەرگەکانی خۆڕاگریو راپەڕین و بەرخودانی تۆمارکردووە، دۆست و دوژمنی سەرسام کردووە، کە نەتەوەیەکی نیشتمان دابەشکراو و ستەمدیدەی وەك گەلی کورد بێ ئەزموونی فەرمانڕەوایی، بێکەس و دوژمن زۆر و کەلا رەق و رق ئەستور، لەناوەندی نەتەوە گەلێکدا کە بچووکترین ماف بۆ کورد رەوا نابینن و لە رووبەڕووبوونەوەی سەربازیو نابەرامبەری لەتەکتیکی جەنگ و پارتی زانی لەدەشت و شاخ و چیا نموونەی زۆر شاکار و زیندوویان بۆ کورد تۆمارکردووە، کە ئێستە و نەوەی داهاتووشی سەربەرز کردووە، ١٦ی ئاب چۆکی بەدەیان پیلان و گەمارۆو شکست و نسکۆو ستەم و بێدادییەك لەسەر کورد و کوردستان داوە، دەیان داستانی قارەمانی سەربازیو رامیاریو رۆشنبیریو فەرمانڕەواییو ئەزموونی-خۆ بەڕێوەبردنی داهێناوە کە لەزانکۆو دانیشگاکاندا وانەی لەسەر دەخوێندریو توێژینەوەی لەسەر دەکرێ.

سەرکردەکانی بەئازایەتیو لەخۆبردن و خۆنەویستیو زوهدو قەناعەت و پاکی بێسنوورەوە دریان بەشەوە زەنگی زۆرداریو دەست درێژی رژێمەکان داوە، سامانێك بۆ کورد کۆبۆتەوە کە کەمتر لە گەلانی دیکەدا بەرچاو دەکەوێ، ئەوەش لەبەر رۆشنایی و تیشکی باوەڕ بە خۆبوون و پشت بەستن -پاش خوای گەورە- بە توانای خودی میللەتی کورد و رەوای کێشەی گەلەکەیانە، دۆزی کورد ئەمڕۆ گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز و پڕ ئومێد و ئاییندەیەکی گەش و



پرشنگدار. راستە ژان و ئێش و ئازاری کورد هەمیشە دولایەنە و ئەستور بووە، چونکە لە چوارچێوەی کیانێکی سەربەخۆی سیاسی و ئیداری باوەڕپێکراودا نەبووە، نەك لە هەر چوارلاوە، بەڵکو لە هەر شەش لاوە گەمارۆدراوە و لەژێر فشارو پاڵەپەستۆدابووە، ماوەی هەناسەی ئازادی نەبووە، چەکی دەستی کورد تەنها باوەڕو پشتی بە ئازایەتی و نەبەردی و سەختی چیاو لێرەوارەکانی کوردستان بەستووە و لەکاتی پیلانی نێو دەولەتیو پەرەسەندنی زانستی چەکسازی چیاکانیش لە زەوی و لە ئاسمانەوە لەژێر پێی و لەسەریەوە دەکرا بە ئاگر و ژیلەمۆ، لەگەڵ ئەوەش بۆ ساتێك وزە و ورە و توانای لە خۆ نەکردۆتەوە، بەهەوڵ و خەبات و فیداکاری کێشەی کوردی گەیاندۆتە ئەمڕۆ کە گەلانی دۆست و هاوکار شانازی پێوە دەکەن و دەستخۆشیمان لێ دەکەن. هەرکەس پیالەیێك خوێن و فرمێسکی بۆ کورد بەخشیبێ شانازی پێوە دەکات و سەربازی پاراستن و گەشەکردنی دەبێت، تەنها خاڵێك کە ئامارەی پێدەکەم: ئەوەیە ئەو دەسکەوت و مافەی کە دەستی کورد کەوتووە لە خۆرا نەبووە و بەخشینی کەس نییە بەڵکو بە خوێنی شەهید و کەم ئەندام و پیر و پەککەوتەکانی کورد هاتوتە کایەوە، دەبێ ئەم نەوەی کە ئێستە دەستی لەکاردایە و بەشێکی لە ئازار چەشتووە نابێ بەخۆڕایی دەسکەوتەکانی شۆڕش و ڕاپەڕین لەدەست بدات و بەکەمتەرخەمی و خوێن ساردی و گوێنەدان لە دەستی کورد بڕوات.

ئەگەر هەتا ئێستا گلەیی و گازاندەمان هەبێت کە کار لە دەستی خۆماندا نەبووە و جلەوی فەرمانڕەوایی لەدەست کوردا نەبووە و هەژار و کەم دەرامەت بووین و سامان و چەکمان نەبووە و، دوژمن بەهێزەوە لەسەر سەرمان بووە خۆ ئەمڕۆ ئەوانە نەماون، کەواتە هەموو بەر پرسین لە پاراستنی ئەزموون، دەسکەوت، فەرمانڕەوایی کورد وەك بیلبیلەی چاومان، کە ئەوەش بەوە دەبێت کاربەدەست لەهەر شوێنێك، لەهەر جێگایەك، لەهەر دەزگایەك لە میللەت دوورنەبێت لەگەڵ ئێش و ئازاری خەڵکدا بێت، بەتەنگ خواست و داواکارییەکانیەوە بێت، بژاری هەموو جومگە سست و لاواز و گەندەڵ و ڕزیوەکان بکرێت و پارێزگاری لە سامان و دەزگا و ئامێر و کەل و پەلی گشتی بەدڵ و گیان بکرێت و، ڕیزەکانی میللەت سەر لە نوێ نۆژەن بکرێتەوە، هەر شوێنێك لە هەر ئاستێکدا کە ئەو لاوازی و نەخۆشی و شستیەی تێدابێت زۆر بە پەلە نۆژداری بکرێت، بۆ ئەوەی بۆ لایەنەکانی دیکە تەشەنە نەکات. گۆڕانکاری و تازەکردنەوە لە ڕەگەوە موتربە بکرێ و پاکسازیو چاکسازی هەمیشە وەك پرۆژە لە گۆڕێدابێت بۆ ئەوەی مرۆڤ بۆ جێگا بدۆزینەوە نەوەك جێگا بۆ مرۆڤ پەیدابکەین.

فەرمودەیەکی سەرداری خۆشەویست دەکەمە کۆتایی:

{رحم الله امرءً اذا عمل عملاً أتقنَهُ}

بەزەیی خودا بۆ ئەو کەسەیە کارێك دەکات بە چاکی و پاکی تەواوی بکات.



# ساتێک لەسایەی قورئاندا

ڕێباز هەردی

بێگومان قورئان کە دەستوری هەمیشەیی و نەگۆڕی ئیسلامە و بەتاقیکردنەوەی سەرکەوتودا گەیشتووەتە ئێمە و یاساکانی ژیانی تێدا پەخش و بڵاوەو سەرچاوەیەکی زۆر گرنگی یاسای ئەمڕۆیە، بەشێوازی بەڕێکی زیندوو و ڕوون و ئاشکرایە، دەتوانری هەموو بنەماکانی فەرمانی شەرع و یاسای تاك و کۆمەڵ، عیبادەو موعامەلە و باري کەسیو لایەنەکانی پەیوەند بە مرۆڤەوەی لێ وەربگیرێ، بۆ هەموو شوێن و کات و بارێك بەپێی قاعیدەکانی ئوسول و فیقهی ئیسلامی فراوان و دەوڵەمەند.

ئێمە لەم باسەدا دوو قاعیدەی زۆر بنەرەتیو بناغەییو ڕێبازی قورئان لەرووی دادوەریو دادگاییەوە ڕووبەڕوو بوونەوەی قەزاییو شەرع کردن باس دەکەین، وەك ڕێبازی ساف و بێگەرد و گۆڵی ئیسلام و گرنگترین دەزگای زیندووی کۆمەڵ کە دادو دادوەریەو هەتا ئێستا یاسا ناسان بە بەرزیو نرخەوە تەماشای دەکەن.

یەکەم: داوای ڕەهاو بێ مەرج لەگەڵ چاکە لەگەڵ کردن (العدل و الاحسان).

هەردوو قاعیدەکەش پێکەوە گرێدراون و پەیوەندن بەیەکەوەو لەیەکتر جیا نابنەوە هەرکامیان بێ ئەوی تر نایەتە ئەنجام، چونکە داد لە فەرماندا لەسەر بێ ڕیاتیو چاکە خوازی ڕووت جێبەجێ نابێ هەتا دادوەرێکی بەهێزو دەسەڵاتدار و بەتوانا و پاك نەبێ، ئەو کات دادوەر، فەرمان ڕەوا، قازی، حاکم سیفەتی هێز و تواناو شارەزاییو ئاگاداریو پاکی تێدابوو گەیاندن و سەندنی ماف بەخاوەن ماف بە تەواوی و بێ دواکەوتن و کەم و کوڕی جێبەجێ دەبێو یاسا باڵادەست و داد سەقامگیر دەبێ، ئەم دوو قاعیدەیە جگە لەوەی دەستورە لەهەمانکاتدا ڕەوشتە، خووە ئەرێتەو تایبەتە بەقورئانەوە، ئەگەر ئەم قاعیدە قورئانییە ئەخلاقیەی قورئان لەکۆمەڵگەی کوردو ئەزموونی ئێستەی کوردستان پیادەبکرێو پەیڕەو بکرێ، ئەوە جگە لەوەی ئاوات و خواست و سەرکردە شاد ڕەوان و بەهەشتییەکان و شەهیدانی کورد بووە، دەبێتە پێناسەو ناسنامەی زیندووانیو لەسەرەتای



# دادوەر وەك گوڵەبەرۆژە لەگەڵ حەق بێت بۆ هەر کوێو هەر کەس دەچێت لەگەڵیدا بێت

دامەزراندنی (کیان و بوون و فەرمانڕەوای) کورد بیری لێکراوەتەوەو هەنگاوی بۆ نراوە،کە بێگومان کورد دەکاتە نەتەوەیەکی زیندووی هۆشیارو شارستانیو خاوەن ژیان و ژیار کە هێزی دادگاو دادی دادوەری هەبوو، ئارامیو ئاسایش بەرقەرارە و لەناوەڕۆکی هەریەك لەم دوو رەوشتە کۆمەڵێك وردە رێگەو رێبازی هەیە کە لەبازنەو تەوەری ئەو دوو رێبازەدا دەسوڕێتەوەو، لق و پۆپی ئەم دوو شارێگەیە کە هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ دادگاو دادوەردایە چ وەك داواکارو خاوەن سکاڵا یان داوالێکراو یان شاهیدو شێوازی وەرگرتن و دادگایی کردن، بۆ هەموو ئەوانە قورئان داوای (عەدل، ئیحسان، ئەمانە، قوة) دەکات واتە دوو زاراوە بۆ داد، دوو زاراوە بۆ هێز. قورئان دەفەرموێ: ﴿ **إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ**/ **سورة النحل -٩٠**﴾ ﴿ **إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ**/ **سورة یوسف-٥٤**﴾ لە ئایەتی یەکەم قاعیدەی یەکەم کە دادو ئیحسانەو لەئایەتی دووەم پێویستمان بەحاکم و ئەمیری پاك و بەهێزەو بەتێکەڵاو کردنی هەردوولا یەك رستەمان دەست دەکەوێ وەك بیردۆزێك بەهەردوو باردا دەخوێندرێتەوەو راستەوانەو پێچەوانەی دروستە کە ئەویش بناغەی دەوڵەتداریو فەرمانڕەوای بەدوو (هێزی داد، دادی هێز) کە ئەگەر ئەم دوو قاعیدە ئەخلاقیە جێبەجێ کرا مرۆڤ کە بەهێز بوو واز لە نیازی ستەم و زۆرداریو خراپەکاریو سروشتیو بەدکرداری دەهێنێ. ئەگەر نموونەی یەك داوا لەئیسلامدا شیتەڵ بکەین و هەموو رەگەزەکانی شی بکەینەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئاینی ئیسلام و قورئان تەئکید دەکەن لەسەر:

یەکەم/ دادوەر وەك گوڵەبەرۆژە لەگەڵ حەق بێت بۆ هەر کوێو هەر کەس دەچێت لەگەڵیدابێت، هیچ هۆکارێك و ئاستەنگێ کاریگەری لەسەر نەبێ، دەروونی، بیرونی، دەرەکیو لاوەکی کار نەکاتە سەر قەناعەتی دادوەر لە کۆڵینەوەو رووبەڕووبونەوەو بڕیاردان: ﴿ **يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوْ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ**/ **سورة النساء-١٣٥**﴾ ﴿ **وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى**/ **سورة انعام -١٥٢**﴾ ئەوە رەوشتی مرۆڤی بەهێزە، سروشتی حاکمی بەتوانایە، هەمیشە رەوشتی بەهێز دەکرێتە یاساو رێسای کۆمەڵ، نەوەك لاوازو بێتواناو کەم دەسەڵات.

دووەم/ لە جێبەجێ کردنی (دادی هێزو هێزی داد) یەکسانی دروست دەبێت بەیارونەیار، دۆست و دوژمن، خزم و بیانی، موسڵمان و ناموسڵمان، دوورو نزیك، ناسیاوو نەناس، چونکە حەق سپاردە دەبێ بگاتە دەستی خاوەنی هەرکەس هەبێت.

سێیەم/ دادوەر بەپێی یاسای قورئان و شەرعی ئیسلامی دادگایی دەکات و پابەندە بەدەقی



قورئان و بۆچوونی خۆی‌و ئارەزووکاری تێدا نییە، ئەگەر دەقی روون و ئاشکرا نەبوو سوود لەرێبازی زانایانی پێشوو وەردەگری‌و ئەگەر نەبوو (اجتهاد) دەکات و لایەنی حەق دەگرێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ/ سورة المائدة-٤٥﴾.

چوارەم/ لەهێزی دادو دادی هێز هەردوو لایەنی خاوەن کێشە گوێڕایەڵ دەبن و نا فەرمانی ناکەن بۆ فەرمانی دادوەر، لە ئیسلامدا ئەوە نییە بە هێز هەرچی ئارەزووی هەبوو ئەنجامی بدات و هەرچی حەزی تێدا نەبوو رەدی بکاتەوە، بەهەمان کێشەو پێوانە ئیسلام لاواز نییە بەرامبەر بەزۆردارو کەم دەسەلآت نییە بەرامبەر بە ستەمکار: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ / سورة الاحزاب-٣٦﴾.

پێنجەم/ یاسای دادگایی کردن بەقورئاندا تەنها دیاری کردن و سەندنی ماف نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەوانەش لێ بووردن و لێخۆش بوون هەیە. ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ/ سورة آل عمران-١٣٤﴾.

شەشەم/ قورئان ئەدەب و ئەخلاقی دادگایی کردن و داواکردن و توێژینەوەو بەرگری کردن بەحەق داناوە: ﴿فَاحْكُمْ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَلاَ تُشْطِطْ وَاهْدِنَا إِلَى سَوَاءِ الصِّرَاطِ/ سورة ص-٢٢﴾.

حەوتەم/ رێبازی قورئان کە تۆمەت و تاوانبار کردن و دژایەتی تەنها بەگومان نییە. بەڵکو دەبێ بەڵگەو شاهیدو دان پێ نان هەبێت کە راست و رەوان و بێ پێچ و پەناو گرێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ/ سورة الحجرات-١٢﴾.

هەشتەم/ لەرووی شایەتی‌و شایەتیدان و پلەی شایەت مەرجەکە پاك و دادپەروەرو بێ نیازو دڵ پاك و بێ دوژمن کاری بێت: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَي عَدْلٍ مِنْكُمْ/ سورة الطلاق-٢﴾و فەرزکراوە کە هەر کەسێ شەهادەیەکی لابێت بەئەمانەت ئەدای بکات: ﴿وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ/ سورة البقرة-٢٨٣﴾.

نۆیەم/ جۆری قازی‌و سیفەتی حاکم زۆر بایەخی هەیە، کە دەبێ زاناو هوشیارو دادپەروەرو شارەزا لەهەموو حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلام و شارەزا لەئوسولی (مرافعة)و قەزاوەت کە خەلیفەی داد پەروەری ئەمەوی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خودای لێرازیبێت بەم شێوەی داناوە (داناو هۆشیارو ئارام و لەسەرخۆ، پاك و ئەمین و عەفیف، شارەزاو زانا، زیرەك و بەئاگا) هەر گەل و ولآتێك کە یاسای تێدا سەروەر بێت و دادگاو دادوەری بەم جۆرە بێت هەمیشە بەختەوەرە.

ژێدەر:

دکتور محمد کوبیسی/ الرسالة الاسلامية ژمارە ١٩٨٥/١٧٨ م.

**دادوەر بە پێی یاسای قورئان و شەرعی ئیسلامی دادگایی دەکات و پابەندە بە دەقی قورئان و بۆچوونی خۆی و ئارەزوو کاری تێدا نییە**



# شنەبای وەشتی سروش و پەیام

# ئیسلام ڕێز لەسامانی مرۆیی دەنێت

عارف مەحمود

ئیسێتا لەجیهانی شارستانی و لەناو گێژاوی نەخۆشییە ترسناك و منداڵ لەبار بردنی بێ ڕەوشتانەو بێ بەزەیی‌و زیادبوونی ڕێژەی تەڵاقدان و جیابوونەوە و کەمبوونەوەی ژنهێنان و شووکردنی شەرعیی‌و یاسایی‌و پەیوەندی (نادروستی) کچ و کوڕو نەچوونە ژێر باری منداڵ بەخێوکردن و بوونی ئافرەت بەکۆیلەی کاروباری ڕەنج و پەیداکردنی پارووی بژێی‌و مەمرەی ژیوارو، خوێن ساردی پیاو لە بەخێوکردنی ماڵ و منداڵ و لەناو ئەم زریان و گەردەلولەدا زەنگی پڕ لەمەترسی‌و هاواری فریاکەوتن بەرز دەبێتەوە، کە زانست و زانیاری بۆ خۆشی مرۆڤە کە مرۆڤ نەما، نەوەی نوێ بەرەو کەم بوون بڕوا، مرۆڤایەتی بەرەو چاڵی نەزۆکی و بێبەر بێت، خۆشی‌و بەختیاری بۆ کێ بێت، یا کێ سود لەزەوی وەربگرێ؟ کورد دەڵێ: کەما بۆ پەزە کە پەز نەما کەما بۆکێ؟ وەڵام بۆ ئەم پرسیارە بە نێش و ئازارە لەم فەرموودەدایە: { فانی مباه بکم الامم یوم القیامة } السنن الکبری٧٠-٧٨/ کە ئیسلام و قورئان ڕێگەو شوێنی زۆری داناوە بۆ زۆر بوونی نەوەی پەیام و باوەر.

١-هاندانی ژن هێنان: ئیسلام هەمیشە هانی پەیڕەوانی دەدا کە زوو ژن بهێنن و زوو شوو بکەن و نەکردنی لەبەر خواپەرستی‌و دنیا نەویستی بەچاك نازانێ، هاوسەر پەیداکردن فەرزە بەمەرجێ دەسەڵات و توانا هەبێ ﴿فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ/ سورة النساء-٣﴾ فەرمانی خودایە بێگومان حیکمەتی گەورەو فراوان هەیە لەهاوسەرگرتن: پاراستنی ڕەگەزو هاوکاری‌و هەرەوەزی نێوان ڕەگەزی ژن و پیاوو خۆشەویستی‌و ئارامی و دڵنیایی پاشەڕۆژو گەشبوونی دڵ و دەروون و چاو بەنەوەی تازەو نوێ‌و تام و چێژی ژیان و سێبەری ماڵ و حەوانەوەو پەرت نەبوونی شیرازەی خێزان و ئاوەدانکردنەوەی زەوی هەتا ئەو ڕۆژەی خودا بۆخۆی کۆتایی پێدەهێنێ، جگە لەبەشداری هەردوو ڕەگی نێرو مێ، لەئەستۆ گرتنی بەخێوکردنی منداڵ و ئەو گوێ نەدان و خوێن ساردییە

> ئیسلام زۆری مەبەستە چاك
> دیاری کردنی خێزان و مێرد بۆ
> پێکەوەنانی ماڵێکی گونجاوو تەباو
> پڕ لە مەهرو مەحەبەت



کەم دەبێتەوە ژیان تام و چێژی خۆی دەبێ.

٢-ئاسان کردن و کەم کردنی مارەیی‌و نەخت، یەکێك لەبیانووە زەقەکانی شوونەکردن و ژن نەهێنان زیادەی مارەیە کە لەدەقی فەرمووده زۆر زەمی کراوە: { ان من خير النساء ايسرهن صداقـا } روح المعـان/ ٢٤٥/٤ و لەریوایەتی شێخی ئالوسیدا هاتووە: { اعظم النسـاء بركـةً ايسرهن صداقـاً } کە زۆری مارەیی شومە گەورەترین هۆکاری مانەوەی قەیرە کچ و کوڕو نائومێد بوون لەژیانی هاوسەری گرانی‌و قوورسی‌و بێ مانای مارەیی ئەمڕۆیە کە هاوسەر گرتنی دژوار کردووە.

٣-قەدەغە کردنی لەباربردن: ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەباربردنی بەتاوان داناوەو تۆڵەو سزای بۆ داناوە، ئەگەر بەهێرش و پەلامار بۆ سەر دوگیان و سکپڕ بێت یان بۆ سەر کۆرپەلە بێت سزای قورسترە کە گیانی تێدابێت وەك تاوان بۆ سەر مرۆڤێکی ئاسایی وایە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ گیان پارێزی ئیسلام لەڕۆژی پەیدابوونی لە رەحمی دایك. خودا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ سُلاَلَةٍ مِنْ طِينٍ/ سورة المؤمنـون-١٢﴾ خوای مەزن لەشانەی یەکەمەوە رێزی لەمرۆڤ ناوە.

٤-تەنگ کردنەوەی مۆڵەت بەتەڵاقدان: ئایینی ئیسلام کە رێگەی داوە بەتەڵاق بۆ چارەسەری هەندێ کێشەیە کە ژیان پێکەوە نەگونجێ، مانەوە نکاح عەزیمەیە و تەڵاق روخسەیە، پێغەمبەر دەفەرموێ: { ابغض الحلال عند الله الطلاق } سنن ابی‌داود ٢٥٤/٢ هەرگیز پەنا نابرێ بۆ تەڵاقدان مەگەر باری دەروونی‌و ژیان و نەخۆشی‌و عەیب و کەم و کوڕی‌و کە هۆکاری جیابوونەوە هەبێت و رێگە چارە نەبێت.

٥-ئیسلام حەڵاڵی کردووە فرە ژنی ئەویش وەك کارێکی مباح هۆکاری زۆر پێویست هەبێت وەك:

١-دیارە ئارەزووی منداڵ بوون و نەخۆش بێت یان عەیبدار بێت

٢-پیاو توانای بێسنوری هەبێت و خێزانی ساردی هەبێت کە نەتوانی توێنیوێتی پیاوەکە بشکێنی‌و پێکەوە ژیان ئاڵۆز بێ.

٣-هەندێجار بەهۆی شەڕو گرانی رێژەی ئافرەت زۆرترە ئەوجا بۆ ئەوەی هەندێ ئافرەت بێبەش نەبێت لە خۆشی ژیان و ماڵ و مێرد و منداڵ فرە ژنی حەڵاڵ کراوە بۆ سوودی ئافرەت. ئایینی ئیسلام لەگەڵ ئەوەی زۆر بایەخ بەزۆری کەس و زیادبوونی ژمارەی مرۆڤ دەدا لەگەڵ ئەوەش هەنگاوی زۆر گرنگ و لەسەرخۆو راست و رەوانی هەیە بۆ پاراستن و گەشەکردن و پەروەردە کردن و بەخێو کردنی ئەم سامانە. بۆ ئەوەی نەوەیەکی کامڵ و بێ کەم و کوڕی لەبارەی لەش و ژیری‌و توانای هەبێت بەهۆی ئەم

ئیسلام هەمیشە هانی پەیڕەوانی دەدا کە زوو ژن بهێنن و زوو شووبکەن، و نەکردنی لەبەر خواپەرستی‌و دنیا نەویستی بەچاك نازانێ



## هۆكاری مانەوەی قەیرەیی كچ و كوڕ و نائومێد بوون لە ژیانی هاوسەری، گرانی و قوورسی و بێ مانای مارەیی ئەمڕۆیە كە هاوسەر گرتنی دژوار كردووە

ئەركانەی خوارەوە:

١-هەڵبژاردنی هاوسەر بە بیركردنەوە، ئیسلام زۆری مەبەستە چاك دیاری كردنی خێزان و مێرد بۆ پێكەوەنانی ماڵێكی گونجاوو تەباو پڕ لەمەهرو مەحەبەت و دەستكەوتنی منداڵی تەندروستیو لەش ساغ و بێ نەخۆشیی وەراسی وەك لاوازی فام و درمەكانی لەشیو بەژن و سەلامەتی چاوو گوێ. پێغەمبەر دەفەرموێ: { تنكح المراة لاربع لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها فانظر بذات الدين تربت يداك } البخاري ج٧/ص٨ لەفەرمودەیەكی دیكەش دەفەرموێ: { اياكم وخضراء الدمنة، قيل يا رسول الله وما خضرا الدمنة ؟ قال المراة الحسنة في منبت السوء } التلخيص الحبير/ج٣/١٤٥.

٢-بایەخدان بەژن و دایك. ئیسلام زۆر ڕێزی ئافرەتی گرتووە چ وەك هاوسەر چ وەك دایك، چونكە تەنها ئافرەت ئەركی بوون و بەخێوكردن و شیردان و پەروەردەكردنی منداڵی لەئەستۆ دەگرێ: { خيركم خيركم لاهله وانا خيركم لاهلي } سنن ابن ماجة/ج١/٦٣٦.

٣-زۆر بایەخدان بەمنداڵ لەیەكەم ڕۆژی پەیدابوونی منداڵەوە ئیسلام بایەخی داوە بەپەروەردەو بەخێو كردن و فێركردنی خوێندن و نووسین و پیشەو ڕام كردنی لەسەر سەربەخۆی ژیان.

٤-قەدەغەكردنی هەر كارێك كە مرۆڤایەتی ئینسان كەم بكاتەوە وەك داوێن پیسیو مەی خواردنەوە و پەیوەندی نایاسایی. قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً/ سورة الاسراء-٣٢﴾.

٥-بایەخدان بە لەش ساغیو تەندروستی بۆ ئەم مەبەستە نوێژو لەش شۆردن و پاك و خاوێنی فەرزكردن.

ئەمانەو ئیسلام وەكو نوێژو ڕۆژوو زەكات و حەجی فەرزكردووە بۆ ئەوەی مرۆڤ هەمیشە لەیادی پەروەردگار بێت و لەخۆی بایی نەبێت و لەدەستوری ئیسلام دەرنەچێت و كۆمەڵێ ئامۆژگاری داناوە بۆ پەیوەندی پیاوو ژن، باوك و منداڵ، گەورەو بچووك، نێرو مێ، خوێندەوارو نەزان، لەم بارەوە قورئان زۆر بایەخی داوە بەهەوڵدان و كاركردن و كۆشش كردن و گوزەرانی لەڕێگەی شەرعیو حەلالەوە پێشكەوتنی زانست بۆ سوودی نەوەی نوێ بێت.

سەرچاوە:
گۆڤاری (الرسالة الاسلامية) ژمارە ٢٠٣/ دكتۆر فلاح شاكر.



بسم الله الرحمن الرحيم

(( و أمّا بنعمةِ ربّكَ فحدّث )) صدق الله العظيم

## بەڕێز و هێژا جەنابی سەرۆك كاك مسعود بارزانی
## سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان

بەبۆنەی (٥٥) ساڵەی دامەزراندنی پارتیمان پارتی دیموكراتی كوردستان بەسەرۆكایەتی و حیكمەتی پێشەوای كورد (بارزانی نەمر)، بەناوی خۆمان و سەرجەم كارمەندانی وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی، گەرمترین پیرۆزبایی ئاراستەی جەنابتان و سەرجەم گەلی كورد دەكەین. لەخوای گەورەو پەروەردگار داواكارین لەژێر سایەی جەنابتان و پارتە پێشڕەوەكەماندا كوردستان ئارام و گەل و نیشتمان شاد و سەربەرز بێت.

والسلام عليكم ورحمة الله و بركاته

عەدنـــــان نەقشبەندی
وەزیری ئەوقاف وكاروباری ئیسلامی
١٤ی ئابی ٢٠٠١



## بسم الله الرحمن الرحيم

## بەڕێز / مەكتەبی سیاسی پارتی دیموكراتی كوردستان

لەیادەوەری (٥٥) ساڵەی دامەزراندنی پارتە پێشڕەوەكەمان پارتی دیموكراتی كوردستان بەسەرۆكایەتی باوكی رۆحی نەتەوەی كورد (مەلا مستەفا بارزانی)، بەناوی خۆمان و سەرجەم كارمەندانی وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی و زانایانی كورد پەروەرو ئایین پەروەر، گەرمترین پیرۆزبایی ئاراستەی بەڕێزتان و سەرجەم گەلی كوردستان و هەڤاڵانی پارتیمان دەكەین، لەخوای گەورەو پەروەردگار داواكارین لە سایەی ئاشتیدا گەل و نیشتمان و پێش مەرگە قارەمانەكانی كوردستان شاد و سەربەرز بن. هەزاران سڵاو بۆ گیانی پاكی شەهیدانی كوردو كوردستان و سەروەریان بارزانی نەمر و كاكە ئیدریسی هەمیشە لەیاد دەنێرین.

والسلام عليكم ورحمة الله و بركاته

عەدنـــــان نەقشبەندی
وەزیری ئەوقاف وكاروباری ئیسلامی
١٤ی ئابی ٢٠٠١





# پانۆرامای سەردانێکی مێژوویی سەماحەتی شێخ دکتۆر مەحمود عەبدولغەنی عاشوور وەکیلی ئەزهەری شەریف بۆ کوردستان



ئا: راگەیاندنی وەزارەت

ئێوارەی رۆژی ٢٠٠١/٨/٢٦ بەرێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەیاوەری بەرێزان خورشید شێرە بریکاری وەزارەت و بەرێز نێچیرڤان ئەحمەد پارێزگاری دهۆك و جێگری بەرپرسی لقی یەکی پارتی دیموکراتی کوردستان و مامۆستا مەلا محەممەدی ئاکرەیی سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان و ژمارەیەك لەمامۆستا بەرێزەکانی کوردستان و بەرپرسانی حزبی و حکومی پێشوازیان لەبەرێز سەماحەتی شێخ د.مەحمود عەبدولغەنی عاشوور وەکیلی مەشیەخەی ئەزهەری شەریف و شاندە یاوەرەکەی کرد کە پێك هاتبوون لەبەرێزان د.محەممەد عبدولحەکەم دیاب سەرۆکی سەنتەری عەرەبی نێودەولەتی بۆ راگەیاند لەقاهیرەو بەرێز عەبدولقادر بریفکانی کەسایەتی ناسراوو نوسەری گەلەکەمان. سەرەتا لەهۆڵی حەوانەوەی لەخاڵی سنووری فیشخابوور بەرێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەناوی سەرۆك بارزانیو هەموو گەلی کوردەوە بەخێرهاتنی کردو گوتی بەخێربێن بۆ لای نەوەکانی سەلاحەددین ئەیوبیو بارزانی نەمر. پاشان بەرەو دهۆك و دواتریش بەرەو



# شێخ د. مەحمود عەبدولغەنی عاشوور:
# من دڵنیام لەئاییندەی کوردستان

هاوینەهەواری سەلاحەددین بەرێ کەوت و لەنزیك هاوینەهەواری شەقڵاوە لەلایەن بەڕێزان ئازاد بەرواری ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و عومەر بۆتانی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیو بەرپرسی پەیوەندی نیشتمانیەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان پێشوازی کرا ئینجا لە هاوینەهەواری سەلاحەددین لەلایەن سەرۆك مەسعود بارزانیەوە بەگەرمی پێشوازی کراو لەدیدارێکدا بەڕێز سەماحەتی وەکیلی ئەزهەری شەریف خۆشحاڵی خۆی بۆ ئەم سەردانە دەربڕیو گوتی ئێوە گەلێکی موسڵمانی گەورەن حەزتان لەئاوەدانکردنەوەی ولاتەکەتانەو حەزتان لەئاشتییە. من دڵنیام لەئاییندەی کوردستان چونکە لەدەستێکی ئەمینداییە. رۆژی دوای سەرۆك بارزانی میوانداریەتی شاندی ئەزهەری شەریفی کرد بەئامادەبوونی بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندیو سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان و ژمارەیەك لەمامۆستایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان و بەرێوەبەری راگەیاندنی وەزارەت لەم دیدارەدا

سەرۆك بارزانی گوتی: سەردانی وەکیلی ئەزهەری شەریف بۆ کوردستان فەتحێکی گەورە بوو بۆ ئێمە. پاشان شاندی ئەزهەری شەریف سەردانی هەولێری پایتەختی کردو چەند محازەرەو بەسەر کردنەوەیەکی پێشکەش بەخەڵکی موسڵمانی هەولێر کرد.

سەرەتا بارەگای مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستانی



بەسەرکردەوەو لەلایەن بەڕێز سەرۆك و ئەندامانی مەکتەبی تەنفیزی پێشوازی گەرمی لێکراو لەباخچەی بارەگاکەدا ئێوارە کۆرێکی بۆ رێکخراو ژمارەیەکی زۆر لەمامۆستایانی ئایینی ئامادەبوون و چەند بابەتێك بۆچوونی لەسەر دەربڕا. پاشان لەگەڵ وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشانگای کتێبی دەستنووسیان لەهۆڵی بۆنە ئایینیەکانی وەزارەتی ئەوقاف کردەوە کە زیاتر لە (٦٠٠) کتێبی مێژوویو بەنرخی لەخۆ گرتبوو مێژووەکەی دەگەڕایەوە بۆ زیاتر لە (٥٠٠) ساڵ و بەدەستی زانایانی کوردستان نووسرابووەوە.



## بەڕێز سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان:

خزمەتکردن بەئایینی پیرۆزی ئیسلام یەکێکە لەئەولەویاتی بەرنامەی کابینەی چوارەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان

دواتر سەردانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستانی کردو لەلایەن بەڕێز نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکومەت بەگەرمی پێشوازی لێکرا. لەدیدارێکدا کە بەڕێزان وەزیری ئەوقاف و بریکاری وەزارەت و سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلام و بەڕێوەبەری راگەیاندنی وەزارەت ئامادەبوون. باس لەرەوشی ئایین لەهەرێمی کوردستاندا کراو بەڕێز سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان دووپاتی کردەوە کە خزمەتکردن بەئایینی پیرۆزی ئیسلام یەکێکە لەئەولەویاتی بەرنامەی کابینەی چوارەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان. دواتر شاندی میوان سەردانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی کردو لەلایەن بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و خورشید شێرە بریکاری وەزارەت و هەموو بەڕێوەبەرو کارمەندانی وەزارەت بەگەرمی پێشوازی کرا. وەکیلی ئەزهەری شەریف لەدیوانی وەزارەت دیاری ئەزهەری شەریفی پێشکەش بەوەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی کردو شێخ عەدنان نەقشبەندیش چەند دیارییەکی کوردەواریو پیرۆزی پێشکەش بەسەماحەتی شێخ مەحمود عەبدولغەنی عاشورو شاندە یاوەرەکەی کردو هیوای خواست سەردانەکەیان بۆ کوردستان ببێتە مایەی دروست بوونی پەیوەندییەکی برایانەو پتەو لەنێوان هەردوو گەلی کوردو کۆماری میسری عەرەبی، پاشان سەرۆکی شاندی ئەزهەری شەریف دیاری خۆی پێشکەش بەبەڕێز خورشید شێرە بریکاری وەزارەت کرد. دواتر شاندی میوان بەیاوەری وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشانگای نووسینی ئیسلامیان لەگەلەری میدیا کردەوە کە لەلایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامییەوە ئامادە کرابوو، زیاتر لە (٤٥) تابلۆی رەنگینی لەخۆ گرتبوو. ئینجا سەردانی تەلاری پەرلەمانی کوردستانی کردو لەلایەن بەڕێزان فرسەت ئەحمەد سکرتێری پەرلەمان و ئەندامانی پەرلەمانەوە پێشوازی کراو هەر لەوێش خۆشحالی خۆی لەسەرجەم بەشەکانی پەرلەمان و شێوازی کارکردنی یاسایی پەرلەمان دەربڕیو بەهاوشانی (مجلس الامة)ی میسری لەقەڵەمدا.

هەر هەمان رۆژ بەڕێزان وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی حکومەتی هەرێمی





کوردستان و د.مەحمود عەبدولغەنی عاشور وەکیلی ئەزهەری شەریف لەدیوانی وەزارەت پرۆتۆکۆلێکی مێژووییان مۆرکرد. ئینجا خەلاتی ئەزهەری شەریف و پەرلەمانی کوردستان ئالوگۆڕ کرا. رۆژی دواتر بەڕێز دکتۆر مەحمود عەبدولغەنی عاشور لەهۆڵی ئەندازیاری لەشاری هەولێر موحازەرەیەکی گرنگی بۆ سەرجەم مامۆستایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان و راگری کۆلیژەکان وتەوەو تیایدا باسی لەتێروانینی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ توندرۆیی و دەمارگیری ئایینی کردو هەموو جۆرەکانی ئیرهاب و توندو تیژی بەپێی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری سەروەر رەت کردەوەو وتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دوورە لەهەر توندو تیژیو توندرۆییەك، ئەوانەی کاری ئیرهابی ئەنجام دەدەن لەئایینی پیرۆزی ئیسلام و کۆمەڵگای موسڵمانان بێبەرین. دوایی بەرەو بارزانی لانەی شێران بەرێکەوتن لەگەڵ بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامیو بریکاری وەزارەت و ژمارەیەك لەمامۆستایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان تاجە گوڵینەی لەسەر مەزاری نەمران داناو سوورەتی فاتیحەی بۆ گیانی پاکی شەهیدان بارزانی نەمرو کاك ئیدریسی هەمیشە زیندوو خوێندەوەو لەوێدا وتارێکی پێشکەش کردو باسی لەمێژووی پەیوەندییەکانی بارزانی نەمرو سەرۆکی خوالێخۆشبووی میسر جەمال عەبدولناسر کرد. ئینجا بەرەو شاری دهۆك بەرێکەوتن و لەوێ سەردانی پارێزگای دهۆك و زانکۆی دهۆك و کۆلیژی شەریعەی کرد، لەهۆڵی کۆلیژی شەریعە موحازەرەیەکی گرنگی پێشکەش کردو لەکۆتایی سەردانەکەیدا بەڕێز وەکیلی ئەزهەری شەریف و شاندە یاوەرەکەی لەلایەن بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامیو خورشید شێرە بریکاری وەزارەت و نێچیرڤان ئەحمەد پارێزگاری دهۆك و جێگری بەرپرسی لقی ١ی پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان و مامۆستایانی ئایینی ئیسلامی لەکوردستان بەڕێزەوەو بە کەژاوەیەکی شایستە تا خاڵی سنووری فیشخابوور بەڕێخرا. پێش چەند دەقیقەیەك لەبەجێهێشتنی خاکی کوردستان هەریەکە لەبەڕێزان شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامیو سەماحەتی دکتۆر مەحمود عەبدولغەنی عاشور وەکیلی ئەزهەری شەریف لێدوانێکیاندا، ئەمەی خوارەوە پوختەی هەردوو لێدوانەکەیە:

**شێخ د.مەحمود عەبدولغەنی عاشوور:**

**ئایینی پیرۆزی ئیسلام دوورە لەهەر توندو تیژیو توندرۆییەك، ئەوانەی کاری ئیرهابی ئەنجام دەدەن لەئایینی پیرۆزی ئیسلام و کۆمەڵگای موسڵمانان بێبەرین**





بەڕێز وەزیری
ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی:

**داواکارم پێکەوە کار بکەین، مێژوومان بەئێستاو ئاییندەمانەوە گرێ بدەین وە هاوکاری ئەزهەری شەریف و وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستانیش ببێتە مایەی ئاییندەیەکی پرشنگدار بۆ کوردستان و سەرجەم موسڵمانانی جیهان**

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا﴾

دوێنێ لەبارزانی قەڵای سەربەخۆیی کوردستان و لەو جێگایە بووین کە گەلی کورد لەرۆژە سەختەکاندا پەنای بۆ دەبات و دڵنیا دەبێت و یەکێکە لەمەڵبەندەکانی تەریقەی نەقشبەندیو جێگای شێخ عبدالسلام بارزانی وە شێخ ئەحمەدی بارزانیو بارزانی نەمرە، بەڕێزتان لەم جێگایە هەموو پایەکانی پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردستان و ئەزهەری شەریف و کۆماری میسری عەرەبیتان دانا. دڵنیاین لەگەڕانەوەتاندا هەموو ئەم بەڵێنانە بەجێ دەهێنن کە لەسەر مەزاری نەمران و لەچەندین شوێنی تری کوردستان بەموسڵمانانی ئەم گەلە ستەمدیدەیەتان داوە. داواکارم پێکەوە کار بکەین، مێژوومان بەئێستاو ئاییندەمانەوە گرێ بدەین وە هاوکاری ئەزهەری شەریف و وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستانیش ببێتە مایەی ئاییندەیەکی پرشنگدار بۆ کوردستان و سەرجەم موسڵمانانی جیهان. داواکارم سڵاو رێزمان بگەیەنن بەسەماحەتی شێخی ئەزهەری شەریف و گەلی میسرو هەموو زانایانی ئەزهەری شەریف، هەروەها داواکارم لە هەرکەمتەرخەمیەك بمانبەخشن یان لەهەر زیادەیەك لەبەرنامەی سەردانەکەتان کە بووبێتە مایەی ماندو بوونتان.

پاشان دکتۆر مەحمود عەبدولغەنی عاشور لەدوا وتەیدا لەهەرێمی کوردستانی عێراق ووتی: بەڕێزان وەزیریو ئەوقاف و بریکاری وەزارەت و پارێزگاری دهۆك و زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان هەرچەند سوپاستان بکەم هێشتا ناتوانم بەتەواوەتی وەسفتان بکەم. تەنها ئەوەندە دەڵێم میوانداری ئێوەم هەرگیز لەیاد ناچێتەوە لەخوای گەورە داواکارم هەمیشە سەربەرز بن و کوردستانیش ئاوەدان بێت. ئەو ماوەی لەگەڵتان بووم وە لەناوتان دابووم بەداخەوە زۆر بەخێرایی تێپەڕی، بەڵام راستیەکەم بەچاوی خۆم دیو هەستم پێ کردو لێی دڵنیا بووم کە زۆر زۆر گەورەترە لەو زانیاریانەی کە لەسەر ئێوەم هەبوو زۆر گەورە تر بوو لەو مێژووەی کە لەسەر گەلی کوردو کوردستانم خوێندبووەوە. گەلێکی راستگۆو ئیشکەرو دڵسۆزم بینی کە دەیەوێت جێگایەك لەژێر خۆردا بۆ خۆی



بکاتەوە، هەموو تواناو هێزەکان لەکوردستاندا بۆ گەیشتن بەژیانێکی ئاسوودەو کۆمەڵگایەکی مەدەنیو پێشکەوتوو کار دەکەن. ئەمانە هەموویان لەژێر سەرکردایەتی سەرۆکێکی خزمەتکارو دڵسۆز بۆ گەلەکەی کار دەکەن، سەرۆکێکە کە نموونەی سەرکردەو سەرەك کۆمارەکانە. ئەو مێژووەی کە لەسەر کوردستان خوێندوومەتەوە پێمان دەڵێ کە بنەماڵەی بارزانی هەمیشە قارەمان و شۆڕشگێڕ بوون، شۆڕش و خەباتیشیان بۆ سەرفرازی خاك و گەلی کورد بووە تا لەهێمنیو ئاسایشدا بژین وە هەست بەدڵنیای بکەن هەمیشە حەزیان لەئاشتیو پێکەوە ژیان کردووە. ئێستا دەڵێم هەندێك لەئامانجەکانیان بەدی هاتووە، دڵنیاتان دەکەم کە لەکۆتایی ڕێگاکەتان بەرەو سەرفرازی بوونەتەوە، منیش پەیمانتان دەدەمێ کە دەنگی زوڵاڵی ئێوە بم لەووڵاتەکەم، بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێت کە هەرێمێك هەیەو بە هەموو توانایەوە بۆ بەدی هێنانی ئاشتیو پێکەوە ژیان و ژیانێکی شایستە کار دەکات و لەملمانێ دایە بۆ گەیشتن بەکۆمەڵگا پێشکەوتووەکان و حەز لەپەیوەندی دۆستانە دەکات لەگەڵ هەموو گەلانی ناوچەکەو جیهاندا. ئەزهەری شەریف سەربەرز دەبێت کەپەیوەندیەکی پتەوی دۆستانە لەگەڵ گەلی کوردو هەرێمی کوردستاندا ببەستێت. بەتایبەتیش لەگەڵ وەزارەتی ئەوقاف و زانایانی ئیسلامی کوردستان. ئێوە گەلێکی موسڵمانی گەورەن، گەلێکی کە لەگەڵ ئاوەدانکردنەوەی هەر گوندێك بیرتان لەدروست کردنی مزگەوتێك کردوتەوە ئەم ڕێزەی ئێوە لەموسڵمانانی دەگرن لەزۆر دەوڵەتەکانی ئیسلامیدا هەستم پێ نەکردووە جارێکی تر سوپاستان دەکەم بۆ هەموو شتێك کە لەراستیدا ووشەی سوپاس بۆ ئێوەی گەلی کوردی موسڵمان بەس نییە. ئینجا بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی کاسێتێکی ڤیدیۆو ئەلبومێکی پێشکەشی بەمیوانەکەی کرد کە سەرجەم دیدارو چالاکیەکانی ئەم چەند ڕۆژەی لەهەرێمی کوردستاندا تۆمار کراوەو بەڕێزەوە بەرەو ووڵاتەکەی بەڕێ خرا.

---

شێخ د.مەحمود عەبدولغەنی عاشوور:

منیش پەیمانتان دەدەمێ کە دەنگی زوڵاڵی ئێوە بم لەووڵاتەکەم، بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێت کە هەرێمێک هەیەو بە هەموو توانایەوە بۆ بەدی هێنانی ئاشتیو پێکەوە ژیان و ژیانێکی شایستە کار دەکات و لەملمانێ دایە بۆ گەیشتن بەکۆمەڵگا پێشکەوتووەکان

---

**ئەزهەری شەریف سەربەرز دەبێت کەپەیوەندیەکی پتەوی دۆستانە لەگەڵ گەلی کوردو هەرێمی کوردستاندا ببەستێت. بەتایبەتیش لەگەڵ وەزارەتی ئەوقاف و زانایانی ئیسلامی کوردستان**



# دەقی پرۆتۆکۆلی مۆرکراو لەنێوان ئەزهەری شەریف و وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی حکومەتی هەرێمی کوردستان

١.تەرخانکردنی چەند مۆڵەتێکی خوێندن بۆ وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستان.

٢.تەرخانکردنی ژمارەیەك کورسی خوێندنی باڵا لە خوێندنە ئیسلامییەکاندا بۆ قوتابیانی هەرێمی کوردستانی عیراق.

٣.گۆڕینەوەی زانیاری لەنێوان ئەزهەری شەریف و وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەجۆرێك خزمەت بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بکات و ئاسانکاری بۆ بانگەوازی ئیسلامی بکات و بەهێزی بکات.

٤.بەپێی ئەوەی کە ئەزهەری شەریف، ئەو نیشانەیەیە کە موسسڵمانان لە هەموو شوێنێکی جیهاندا بە پێشڕەوی دەزانن، لەبەر رۆشنایی ئەوە، هاوکاری وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بکات بۆ دەستەبەرکردنی سەرچاوەی ئایینی و کتێب.

٥.هاندانی ئاڵوگۆڕ کردنی شاند و ناردنی بانگەوازخوازان لە ئەزهەری شەریفەوە بۆ هەرێمی کوردستان و بە پێچەوانەوە بەشێوەیەك خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بکات و پەردە مێژووییەکانی نێوان ئەزهەری شەریف و هەرێم پتەو بکات.

٦.کردنەوەی لقێك لە لقەکانی ئەزهەری شەریف بۆ خوێندنە ئیسلامییەکان لە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان هەر وەك وڵاتانی دیکە، کە تیایاندا کراوەتەوە، ئامادە کردنی شوێنێکی شیاو بۆ خوێندن و دەزگایەك کە ئەزهەر مامۆستا و بەرنامەی بۆ بنێرێ.

**ئەم رێکەوتننامەیە کاتێك دەکەوێتە کار کە پایەبەرز ئیمامی گەورەی مەشیەخەی ئەزهەری شەریف ئیمزای بکات.**

عەدنان نەقشبەندی
وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی
هەرێمی کوردستان
٢٠٠١/٨/٣١

دکتۆر مەحمود عبدولغەنی عاشوور
وەکیلی ئەزهەری شەریف
٢٠٠١/٨/٣١





# هەژار كوردی دەوڵەمەند كرد

نوری حەمە لەتیف

با ئەكادیمیانە نیگاكەین و مەیدانی ئەم ژیانی گێتییە ئاوا كەین، بەو پێیەی مرۆڤ گەلێكی پێگەشتووین و بەرهەمی كارایشمان بەرسڤێكی جددی و یەكلاكەرەوە بن لەمەڕ سەرجەمی پرسیارەكان. لێرەوە ئەگەینە ئەوەی كە بڵێین ئەكادیمی بوونی هەریەك لە تاكەكانی كۆمەڵگە مانای بینین و ئەداكردنی رۆڵێكی یەكجار ئەكتیڤانە بۆ وێنا كردنی ماڵی مرۆڤایەتی و قوتار بوون لە پاشرەفتەیی و وەهم و خۆخواردنەوە. بەڵام لەكوێوە و چۆن دەست پێ بكەین؟.. ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ: (وانە بەناو پەروەرندەت!، كە زیندەوەر كاری ئەوە، جنسی مرۆیی لە جڵتەیێ وەدی هێنا، بخوێنە كە خودانی تۆ لە هەر كەس دەهەندە ترە، ئەو خودایەی بەهۆی بنووسی راهێنا، مرۆی لە.شتێ راهێنا كە زووتر پێی نەزانیبوو) سورەتی عەلەق.

ئەمەیە خاڵی دەستپێك.. (بخوێنە).. ئەوكات، ئەوكات دەبیتە خودان ژیان و پاشان سوارچاكی مەیدانی رەستاخێز..

پرشی ئازادی كوردستانی عێراق بوو بە خێر بۆ هەموو بەشەكانی كوردستان، بەتایبەتی لە رووی پەخش و بڵاو بوونەوەی كایەكانی مەعریفە و بوارە زمانەوانییەكان و رەنگدانەوەی بۆ قاڵبی هەموو هزر و بیروڕا جیاجیاكانی گۆڕەپانی ئیسلامی و نێودەوڵەتی.. لە هەموو زیاتر، دڵخۆشی و بەختەوەری ئیمەمانانی قوتابیانی قورئان و رێبوارانی وشەی رەسەنی كوردییە كە هاوئاهەنگ بتوانین ئاوێزان بین و بە هەموو لا رێگای نەتەوەكەمان بۆ رێبازی راستەقینە هەنگاو بهاوێن.

خودا بۆ خۆی دەفەرموێ (مە خۆمان ئەم قورعانەمان ناردۆتە خوار، هەر ئێمەیشین دەیپارێزین) ئەمە دەقی قورئانە كە بەم شێوەیە پەروەردگار



ڕەوانەی کردووە بۆ سەرداری مرۆڤایەتی و ڕابەری هەموو جیهان: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ/ سورة الحجر/ ٩﴾.

کە مامۆستای بەهەشتی (هەژاری موکریانی) کردوویەتی بەکوردی بەو دەقەی سەری.. هەرچەندە کورد لەسەرەتای سەدەی بیستەوە هەتا کۆتایی ئەو سەدە بەرچاو روونە لەبەرهەمی ڕاڤەی قورئان، بەڵام ئەوە یەکەمجارە کە کورد زمان بتوانێ ڕاستەوخۆ وشەبە وشە لەقاڵبێکی پڕ لەرەوانبێژیو هونەری داڕشتن و بەکار بردنی ستایلی زمانی ستانداردی کوردی سروشی پەیامی خودا بەگەل بگەیەنێ کە ئەوەش مژدەیەکی ئێجگار گەورەو هیوا بەخشە لەبواری خزمەتکردنی قورئان لەلایەك و خزمەتکردنی کورد لەلایەکی دیکەوە. بێگومان ڕاڤەکردنی قورئان وشە بە وشە لەنێوان زانایانی فیقهی ئیسلامیدا ڕای جیاواز دەبیندرێت. پێشەوای موسڵمانان (ئیمامی ئەعزەم ئەبو حەنیفە) ئەو بۆچوونە پەسەند دەکات کە دەتوانرێت قورئان بەزمانێکی دیکە واتە جگە لەزمانی عەرەبی بخوێنرێت. ئێمە وەك ڕێبازی شافیعی بەلامانەوە وایە کە خوێندنی قورئان بەزمانی کوردی یان بەزمانێکی تر جێگەی تێکستە عەرەبییەکە ناگرێتەوەو نوێژی پێ دروست نابێ، بەڵام ئاشنامان دەکات بەگەورەترین دیاری خودا بۆ مرۆڤایەتی کە ئەویش (قورئان)ە. هەموو ئایەت و سورەتێك توانابرە بۆ هەموو عەرەب کە بەزمانی خۆیان هاتۆتە خوار، بێگومان بۆ ئێمەی کورد زیاتر توانابڕە کە بتوانین بەزاراوەی کوردی مانا و مەبەستی سروش و پەیام دەربڕین.. لەبەر ئەوە ئەم نووسینە تەرخان دەکەین بۆ نواندن و پێشکەش کردن و نرخاندنی ئەم جۆرە وەرگێڕانەی قورئان بۆ زمانی کوردی.

ئەم قورئانە وەرگێڕدراوە لەلایەن (یانەی چاودێری لەسەر چاپەمەنی قورئانی پیرۆز)ەوە بەچاپ گەیشتووە لەگەڵ خوێندنی (عاصیم) لەسەر گێرانەوەی (حفص)، وەزارەتی ڕۆشنبیری ئیسلامی ئێرانیش یارمەتی لەچاپدان و پەخش و بڵاوکردنەوەی داوەو ئەوەی جێی ئاماژەشە بەرێزان (محەممەد هادی مورادیو محەممەد ماجد مەردۆخ ڕۆحانی) ئەرکی بەچاپگەیاندنیان لەئەستۆ

**پرشی ئازادی کوردستانی عێراق بوو بە خێر بۆ هەموو بەشەکانی کوردستان، بەتایبەتی لەڕووی پەخش و بڵاوبوونەوەی کایەکانی مەعریفە و بوارە زمانەوانییەکان**



گرتووە، کە بەراستی وەك خۆیان باسی دەکەن زۆر تووشی ئازار بوون هەتا سەرکەوتنیان وەدەست هێناوە. لەژیانی هەژاردا خۆیان راستەوخۆ بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ هەموو دەقەکانیان وەرگرتووەو هیچ گومان و دوو دڵییەك نەماوە کە ئەمانە بۆچوون و وشەی هەژاری رەحمەتی بن بۆ قورئان. خۆ قورئان لەزمانی عەرەبیشدا لەوە گەورەترە وشەیەك تەنها یەك مانــاو مەبەســت بگەیــەنێو نەگونجێ بۆ مانایەکی دیکە، چونکە زۆربەی رێبازەکانی فیقهی ئیسلامی لەسەر بۆچوون و مانــاو مەبەســت و یاســاو ﴿ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ/ سورة البقرة-٢٢٨﴾ (تەلاّق دریاو لەسەریانە هەتا سێ جار لە بێ نوێژی پاك ببنەوەو چاوەنۆڕ بن)، کە وشەی (قروء) بۆ هەردوو مەبەستی پاکیو بێ نوێژی لەعەرەبیدا هاتووە، لەبەر ئەوە هەر چۆن لەعەرەبیدا وشەی (قروء) بە دوو مەبەست هاتووە لەکوردیشــدا وشەی (بێ نوێژی) دانراوە بۆ چەمکێکی هاوبەش لەنێوان پاکیو بێ نوێژیدا کە (سێ پاکی) یا (سێ بێنوێژی) هەمان کات دەکات کە بریتییە لە (سێ مانگ و دە رۆژ) چونکە ئەگەر پاکیو بێنوێژی مانگێکی ئاسمانی بێت بەهەردوولا ئەوە سوپاس بۆ خوا دەیان و سەدان سەرچاوەی (تەفسیر)ی نایاب هەیەو دووبارە سوپاس بۆ خوا کوردیش سامانێکی دەوڵەمەندو بەنرخی لەم بارەیەوە هەیە بەتایبەتی لەلایەن بەهەشتیان (مەلای گەورەی کۆیەو شێخی خاڵ و مامۆستا مەلا عوسمان و مامۆستا مەلا کەریمی بیارەو دکتۆر محەممەد ساڵح ئیبراهیمیو مامۆستا بورهان و مامۆستا مەحمودو گەلێك زانای دیکەی بەرێز کە قورئانیان بەشێوەی تەفسیر نووسیووەو بڵاوکردۆتەوەو زمانی کوردیان پێ پیرۆز کردووە.

داوادەکەم کە قورئان خوێنەکان هەمیشە لە خزمەت ئەم قورئانە دابن و هەریەکە و نوسخەیەکی لە کتێبخانەکەیدا هەبێ

بەهەرحاڵ ئەوەی مامۆستا هەژار جیاوازی بەرچاوی هەیە کە بەم چەند خاڵەی خوارەوە پەنجەنومای دەکەم:-

١-(مامۆستا بۆ ئەم ئاخرین بەرهەمەی کە لەهەموو بیرو زانست و خودو هەست و روح و گیانی جەوهەرێکی پیرۆزی بەرهەم هێناوەو لەسەر کاغەزی ریشتوە) پاشبەندی قورئانی پیرۆز وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار.

٢-مامۆستای رەحمەتی زۆری مەبەست بووە کە ئەم وەرگێڕانەی قورئانی پیرۆز بۆ

رێساکانی قورئان جیاوازیان هەبووە. ئیدی هەرگیز ناگونجێ لەزمانی کوردیشدا وشەیەکمان دەست کەوێ کە بتوانین وەك خودا مەبەستیەتی لێکی بدەینەوە.. با بەوردی تەماشای ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەین لەگەڵ وەرگێردراوە کوردییەکەی: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ هەژماردەکرێت.

کەواتە وەرگێڕانی قورئان بۆ زمانی کوردی یان بۆ هەر زمانێکی جیا لەعەرەبی ئەگەر نەتوانرێ دەقاو دەق مەبەستەکە بگەیەنێ. ئەوا ماناو مەدلولێکی وشەکە دیاری دەکات. خۆ ئەوەشی گەر بیەوێت قوڵترو فراوانتر رۆبچێتە ناو قورئان،



سەر زمانی کوردی (ببێتە هۆی مانەوەو پەرەستاندنی زمانی کوردیو بەکوردیو بەخۆداهاتنەوەو شانازی گەلی کورد). هەمان سەرچاوەی پێشوو (پاشبەند).

٣-مامۆستای گەورە سوودی لە هەموو مامۆستایانی پێش خۆی وەرگرتووە وەك ئەزموونێکی سەرکەوتوو لەگەڵ شارەزایی بێئەندازەی لەزمانی عەرەبیو فارسیو نەخاسمە هەموو زاراوەکانی دیالیکتی کوردی. چونکە ئەم قورئانە کە مێژووی (١٤٢٢) ساڵە هەموو ساڵێك زیاتر لە (٣٠٠) جار بەعەرەبیو فارسیو هەموو زمانەکان تێکۆشاون تەرجوومەیەکی بێ کەم وکوڕی بەرهەم بهێنن، بەڵام هیچ وەرگێڕانێك بێ کەم و کوڕی نەبووە.

٤-ئەم جۆرە دەقە کوردییە لەمامۆستا هەژارەوە نرخێکی تایبەتی هەیە، چونکە مامۆستا کوردیزانێکی بێ هاوتاو ئەدیب و رووناکبیرێکی گەلەکەی بووە لەکۆتایی ژیانیشیدا بووە توانیویەتی پێش ئەوەی گیانی پیرۆزی بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری کردەوەیەکی چاکەی پێ بێت بۆ ئەوەی شەفاعەتی لای پەروەردگاری بۆ بکات و، شیعرێکی خۆشی بەکۆمەڵێ باکگراوندی فەلسەفی مەعریفییەوە گەواهی دەدات بەم مەبەستە!

**بە کوردی ئەژیم . . .**

**بە کوردی ئەمرم**

**بە کوردی ئەیدەم . . .**

**وەلامی قەبرم**

**دیسان بە کوردی . . .**

**زیندوو دەبمەوە**

**لەو دنیاش بۆ کورد . . .**

**تێهەڵئەچمەوە**

ئەوەتانێ هەژار چ بوونەوەرێکی دەوڵەمەندی خزمەتکارەو پاش وەفاتیشی لەرێگەی ئەو کارە گەورەیەوە هەر خزمەت بەکورد دەکات.

٥-پاشە رۆژ لەبەرچاوەو رۆشنەو مامۆستا هەژار بەم کارە گەورەیە زمان و وێژەی کوردی لەهەموو تانەو تەشەرو داوێکی نەیاران قوتار کردو زمانی کوردی بنجی داکوتاوەو تان و پۆی ئاوریشمی خۆی گرێداوە لەگەڵ کەلامی خوداو (بەهیچ کێژەڵوکەو هەرەس و سێڵاوێك نافەوتێو لەبن نایە) هەمان سەرچاوە (پاشبەند).

٦-(لەمێژووی وێژەی جیهاندا دانەدانەیەك شاکاری واهەڵکەوتوون کە تێپەڕی ساڵ و مانگ لەبیری نەبردونەتەوەو بوونەتە هۆی مانەوەو پەرەستاندنی زمانەکەیان) ئێمەش بەهۆی ئەم قورئانە پیرۆزەو ئەم شاکارە دەگمەنەی وەرگێڕانی قورئان زمانی کوردیمان گەیاندۆتە لوتکەو ترۆپکی رەوانبێژی وێژەیی‌و نەمرییەوە.

٧-ئەم کارە بەدەم و زمان زۆر ئاسانە، بەڵام لەناوەڕۆکدا کارێکی یەکجار گرانە و زۆر ماندووبونی لەسەر کراوە هەتاوەکو گەیشتۆتە ئەم بەرهەمەی ئێستا. کە بەراستی دوو زانا، دوو شاگردی قورئان، دوو هەژار دۆست. دوو بەئاگاو شارەزا بەزمانی کورد مامۆستایان (محەممەد هادی مرادیو محەممەد ماجدی مەردۆخی رۆحانی) لەگەڵ دەیان سەربازی ون ئەم کارەیان لەپاش وەفاتی مامۆستا هەژار فەراهەم هێناوە، کە پێشەکی ئێمەی کوردو رێبوارانی رێبازی قورئان. سوپاس و قەدرو پێزانینیان پێشکەش دەکەین و بێگومانیش پاداشتیان لای پەروەردگارو پاشان لای میللەتی خۆشیان وەردەگرن. چونکە زۆر جار وەك خۆیان دەڵێن لەسەر تاقە وشەیەك کە نەگونجابێ چەندان رۆژو حەوتوو راوەستاوین هەتا راستییان بۆ دەرکەوتووە، دیارە



تەنــــها خـــــوای دەهـــــەندەو دلۆڤانیشە کە بێ هەڵەو پەڵە و کەم و کورتییــە لەبەر ئـەوە تایبەتمەندی ئەم شاکارە دەبێتە کتێبــی ســـەدەو ســـەردەم کـــە مێژوونوسـان لەسـەر رووپـەڕی شانامەکانی خۆیان بـۆ سـەدەی (٢١) دەینووسنەوە.

دوا وشـەم ئەوەیـە وەك چـۆن قورئـان دەسـتورێکی زینـدوەو لــەناخ و هەســتی هــەموو موسـڵمانێکدا رەگـی داکوتـاوە. پێویستە بۆ کارپێکردن و جێبـەجێ کردنـی فەرمانــەکانیش هەمیشــە بــێ سســـــتیو دواکــــەوتن مرۆڤێکـی کـارا بـــین، خـــوای دەهـــــــەندەش دەفەرموێ: ﴿وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ/ سورة التوبة-١٠٥﴾ کە هـەزاری بیریـاری رەحمـەتی ئاوا دەیکاتە کوردی: (بێـژە، دەسـا وەکارکـەون، کـاری ئێـوە بەزوویـەکی زوو لای خـوداو پێغەمبـەریو خـاوەن باوەڕان دیـار ئـەداو بـەو زوانـە دەبرێنـــەوە بـــۆ لای زانـــا بـەنادیاریو دیـاران، ئەوسـا ئاگادارو دەساکە چۆن کارێکتان کردووە).

بەهـــەمان گەرمییــــەوە روو لەهـــەموو دانـــاو بیریـــارو رۆشنبیرێك دەکەم کە ئەم جۆرە کوردییـەی موتوربـە بەهـــەموو زاراوەکـــان و بـــن زاراوەکـــان لـەزمانی کوردیـدا بکەنـە زمـانی یەکگرتووی وێژەییو نووسین و رێنووســـی زمـــانی کـــوردی، هەڵـە نووسـین رزگارمـان ببـێ. هـــەروەها بەهـــەموو گـــەرمیو دڵسـۆزییەکەوە داوادەکـەم کـە قورئــان خوێنـــەکان هەمیشـــە لەخزمـەت ئـەم قورئانـە دابـن و هەریەکــــەو نوســــخەیەکی لەکتێبخانەکـــەیدا هـــەبێ، بـــۆ ئـەوەی کـاتی قورئـان خوێنـدن شارەزای تـەواوی قورئـان بـن و هەمیشە لەبـەرچاویاندا بێـت بـۆ تێگەیشـتن و پێگەشـتن و بـەهرە وەرگرتـــن لەخوێندنــەوەی کـــە بەراستی یەکێك لـە هـەرە کارە چاکەکانی ئـەم قورئانـــــــــە وەرگـــێڕدراوە ئەوەیـــە کـــە دەتوانرێــــت رۆژانـە قورئـانی تێدا بخوێنین بەبێ ئـــەوەی چـــاوو دڵ و هەست و سـۆزمان لـەخودی قورئان نـامۆ بێـت، بـەم پێیـەش هــەژارێك گــەلێکی دەوڵەمــەند کـردو زمـانی کوردیـش چـووە ریزی ئەو زمانە زیندووانەی کە بوونەتە بەرگی قورئان.

> زۆربەی رێبازەکانی فیقهی ئیسلامی لەسەر بۆچوون و مانا و مەبەست و یاسا و رێساکانی قورئان جیاوازیان هەبووە ئیدی هەرگیز ناگونجێ لە زمانی کوردیشدا وشەیەکمان دەست کەوێ کە بتوانین وەك خودا مەبەستیەتی لێکی بدەینەوە

هـەروەك قورئـانی پـیرۆز بـووە فاکتــەری یــەکگرتنی زمـــانی عـەرەبی با ئێمەش لـەرێگای ئـەم (قورئانـــــــە وەرگـــــێڕدراوە کـوردی)یـەوەو لـەژێر سـێبەری ســـروش و پـــەیامی ئیلاهیـــدا زمانەکەمان یەکبگرێت و لە (دوو شـێوەزار)ی و پـەرت و بـڵاویو

ژێدەر:

قورئـانی پـیرۆز وەرگـێڕانی/ مامۆستا هەژار



# ئازادیی زانکۆ

شادڕەوان
د. عەبدولا نەقشبەندی

**پێش کەشە بۆ:**

زانایان: کە شاکارەکانی زانست فرەوان دەکەن و لەسەر چەشمە دوور نابن

مامۆستایان: ڕاستییەکانی زانست بڵاو دەکەنەوە لەبازنەکانی دەرناچن.

قوتابیان: ئەڤینداری گوڵی زانستین و لەهەواری بەهاری لانادەن.

بۆ ئەوانەو جگە لەوانەش هەموو ئەوانەی زانکۆ بەمەنارەی تیشک ئاوێزانی ڕاستیو دوانگەی ڕاستیو شوێن حەوانەی سەربەستی توێژین و ژیری ئەم کتێبە دیاری بێت.

## دەسپێک:

ئەم پەڕاوە باسی شیرینترین چیرۆک دەکات لەرووی ئێستەی ژیان، باڵندەی نازداری کۆتری ئازادی زانکۆ نیشان دەدا، کە چۆن شێواوە لەخۆرنشین، بووەتە تەیری عەنقا ناوی هەیەو ناوەڕۆکی نییە نیشانت دەدا کە قەلە ڕەشەی (ئیستعمار)ی وێرانکار کە بەهاودژ ناویان ناوەو دەنووکی درێژ کردوە لەوێنەی مرۆڤ و درندایەتی گیاندارە گۆشت خۆرەکان بۆت باس دەکات کە زانستی دروست لە کێڵگەی نادروست چێنراوەو زاڵ بووە بەسەریاو داگیری کردوە، لەکوێ وشە لادەدرێ لەشوێنی خۆو بووکی رازاوەی پاک دەشارێتەوە لەشوێنی گیاکەڵەی پیس شین دەبێ.

بۆت باس دەکات گەوهەری خۆرهەڵات ڕەنگ کراوە لەسەر گوڵدانی هزرو عەقل بەهەمەڕەنگی زانیاریو حیکمەت و یاساو وێژەی زمانناسییو لەسەر خاك و تۆز دانراوە پاڵی چاکەو خۆشەویستیو ژیارو ئاشتیو هونەری ژیان ئەو کتێبە بۆت دەگێڕێتەوە چیرۆکی ئەو رۆژهەڵاتییە کە لەخۆرهەڵاتداو کەنارەکانی ژیاو خوێندنی لەدیاریترین دانشتگەکان و لەنزیکەوە خەڵکی تاقیکردەوە بەکردارو بیرو نەریت و تاڵ و شیرینی ژیانی چەشتووە، تۆش خۆرهەڵاتی مێینەو نێرینە، خوتان بەپارانەوەو خوتان بەکەم زانین گرتووە، ئەگەر حەز دەکەن رووی ڕاستیو دروستیتان لەخوو خدە بۆ روون بێتەوە ولاتان ناسازە هەست بەکەمی. ئەم کتێبە ورد بخوێننەوە، ئاگاداری چیرۆك و زانیاریو روون کردنەوەکانی بن، کە خوێندتانەوە مرۆڤتان بۆ جیا دەبێتەوە لەدێوو درنج، باش لاتان روون دەبێت ئەگەر تێ بگەن ئێوەن گەورە، خۆ کتێب پەندو رووداوو حاڵەت پێشکەش دەکات بەنەوەی نوێ لەسەر رووی وشەو گفتار ئەمەو ماوە دیاری بدەین بەخوێنەر لەم دەسپێکەدا ئاواتی سوودو قازانج و خۆشی بۆبخوازین لەخوێندنەوەو داواش بکەین کە خودا پاك و بەرزو خاوەن بەخشندە بۆ ئێمە و ئێوەش زانیاریو تێگەیشتن ورێگە گرتن.

## دانشگا حەرەمی ئارام

چەند جوان و رازاوەیە ئەم دەستەواژە پڕ مانایە دڵ لەئامێز دەگرێ، بەڵام داستان و سەرچاوەو پاش ماوەی لەدەروونیدا دروست کردوە ناچارین باسی بکەین بۆ ئەندێشمەندان بۆ چاوڕوونی عەقل و هۆش، دەبا لەم بارەوە یان لەم سێ ڕەهەندە لەم وشە شۆخە بدوێین.

زۆر پیاو باشی سەردەم بۆمان دەگێڕنەوە کە ئەوانەی پێمان سپێرا دامەزراندنی زانکۆی بەغداد



دانانی ڕێسای توشی دوو دڵیو سەراسیمە بوون چۆن دەقێك بدۆزنەوە بۆ ئازادی زانكۆ كە هەموو تەراوگەكان بەكورتیو ئاشكراو ئامـاژەو هێما بكرێتەوە. ئەو كەسەی كە گەیشتە ئەم شۆخە وشەیە لەگەنجینەی وێـژەو یاسـا بەهەشتی ماموٚستا (منیر القاضی) راگری كۆلیژی (ماف) كۆلیژی یاساو ماموٚستای گۆڤاری (ئەحكامی عەدل)و پاشان یاسای شارەستانی عیراقی بوو بۆ ماوەیەك كە ئەوكات شالیاری زانستی بوو بەنیاز بوو كە یاسا بۆ زانكۆ دابنێ.

گوفتار لێرەدایە بەچ سەرچاوەو كانیاوێك بوو كە ئەم پەلكە قەشەنگەی لێ وەرگیرا؟ دەبێت ئەم ئاودێرە بەرێكەوت و بێ هۆكار ئەم دەرئەنجامەی زانیبێت یان لەشارەزاییو بەڵەدیو زۆر لێ خواردنەوە بێت یان لەوانەیە پێش وەڵام پرسیارمان لێ بكەن یەكەم جار لەكوێوە بوو، بەڵام ئەوە گرنگ نییە هەر كەس بێت، بەڵكو گرنگ ئەوەیە پێناسەی ڕەگەزی بكەین بەڵكو پێناسەی زانست و ڕۆشنبیری كە شایستەی كردوە بۆ ئەم دۆزینەوە، گریمان (زەیدی كوری عبیدە) تەنها ئەوە گرنگە ئەوەی كە ئەمەی دۆزیوەتەوە تایبەتمەندی ڕۆشنبیری و ژیاری هەیە و ئێمە لە نزیكەوە هاوچەرخی هێژا قاضی بووین و دەزانین ڕادەی زانیاری ڕاستە، خوالێخۆش بوو ڕێزدارێكی عەرەبی بوو و زمانی نەتەوەكەی شارەزا بوو بەتێگەیشتن و زانست و ئەدەب و خوێندنی بۆ بروانامەی باڵا نەبوو لە دانشگەیەكی ئەورووپی لەخۆرئاوای زەوی و خۆرنشین و گومان نابەم زمانێكی غەیرە عەرەبی ئیسلامی زانیبێت، بەڵام زمانی خۆی وەلانەناوەو بەزمانێكی بێگانەی بگۆرێتەوە و، ژیاری خۆی بەكەم نەزانیووە لە بریتی ئەو ژیاری دیكە بەگەورە بزانێ.

لەو عەرەبانە نەبوو كە خۆی بەعەرەب بزانێو زمانی عەرەبی بەكەم بزانێو خۆی بەموسڵمان دابنێو ژیاری ئیسلامی بەسووك دابنێ، لەوانەش نەبوو كەوا بزانی زمانی عەرەبی مەلەوانی رووبارو دەریا بەدوردۆزو پیاوی بۆق و بۆقی مرۆڤ ناوبنێ لەوانەش نەبوو كە جیاوازی نەكات لەنێوان سۆزی لاوێكی نامۆ لە نیشتمانی خۆی بە (حَنین) و(حُنین) ناوی داماوەكەی خاوەن پێڵاوی بەناوبانگی ناو دورگەی عەرەب، بەڵكو ئەدەب و یاسای لەسەرچاوەی رەسەنی ژیاری ئیسلامی وەرگرتووە هەر لاوێك قورئان و فەرموودەو فەرمودەو كەلتور بخوێنێو فێری یاسا بێت لە(ملتقى الابحر)و (فتح القدير)و (مرشد الحيران)و قوتابیانی بەگۆڤاری (الاحكام العدلية) رابێنێو جیاوازی زانایان و (مجتهيدان) لەبڕگەكانییەوە فێر بكات، ئەو لاوە بێ دەسەڵات نییە.

لەدۆزینەوەی وشەیەكی درەخشاوە بۆ مەبەستێكی تازە ئەگەر حەز دەكەی بزانی ئەم دەقە جوان و گشتگیرە (زانكۆ حەرەمی ئارام) كە مادەی سێیەمی یاسای زانكۆی بەغدایە لەچی وەرگیراوە

وەرە لەگەڵ من ئەم ئایەتە لەسورەی (قصص) بخوێنە ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّنْ لَهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾و لەسورەتی (عنكبوت) ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا﴾ ئەو لەبارەی دانشتگاكانی تازە ئەم فەرموودەی كە پێغەمبەری خودا درودی خوای لەسەر بێ لە ڕۆژی رزگاری مەككە خوێندنی ﴿**من دخل داره واغلق عليه فهو آمن ومن دخل المسجد فهو آمن..**﴾.

ئێستە دەزانین ئەو كانییەی ئەو دەقەی لێ وەردەگرین و زانكۆی زانستی پێ دادەمەزرێنین لەكوێوەیە.

**تێبینی:**

**خوێنەری بەڕێز ئەو دەقەی سەرەوە وەرگێرانی پێشەكی كتێبی زۆر نایابی دكتۆرعەبدوڵلا نەقشبەندییە لەژێر ناوی (الحرية الجامعية) كە چاپی ١٩٨٩ لەسەرە.**



# توانابڕی قورئان
# لە بوونی هەموو شتێکدا هەیە . . .

دیاکۆ سەلام

کە پەروەردگار ئەو گێتییەی داهێنا هەموو شتێکی بەپێی کەس و شوێن و کاری هەر کەسێ لەجێی شیاوی خۆی دانا... تاکو ئێستا ئەو رێسا ئاسمانییە بەردەوامە و تا گێتیش بمێنێ ئەو رێسایە کاری خۆی دەکات، هەموو زانایانی سەردەمیش بەهەموو توانایەکیانەوە بەو هەموو پێشکەوتن و تەکنەلۆژیا و زانستی پزیشکی و هەموو پێشکەوتنەکانی ترەوە نەیانتوانیووە گەڵایەکی بچووک دروست بکەن و بهێننە وجود، جا چ جامی دروست کردنی میوەیەك، ئاژەڵێك، بەشێکی لەشی مرۆڤ و ... هتد.

ئەو هەموو زانستەش کە رۆژ لەدوای رۆژ دەدۆزرێنەوە وەنەبێ زانایان دایبهێنن، بەڵکو ئەو زانستانە لەقورئاندا ناویان هەیەو بزرنین، بەڵام ئەوە حیکمەتێکی خواییە و بواری بەمرۆڤ داوە لەژیاندا ئەو زانستانە ئاشکرا بکەن بۆ ئەوەی موعجیزەی قورئان و پیرۆزی یەزدانیان رۆژ بەرۆژ زیاتر لەلا ئاشکرا بێت. هەریەکیش لەئێمە پابەندە بەوەی بەدوای موعجیزەکانی قورئاندا بگەڕێو پیرۆزی یەزدان ئاشکرا بکات و بەهۆشی خەڵکی ئاشنا بکات.. هەر هەموومان قوتابی ماندوو نەبووی ئەو رێبازەی ئایینە پیرۆزەین و دەبێ لەدوای هەموو شتێکدا حیکمەتێك هەبێ.

د. دلاوەر محەممەد سابیر یەکێکە لەو خۆنەویستانەی کە زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی لەخزمەتی ئاشنا بوون بەو شاکارە خوابیانەیەو لەکتێبی (بحوث مقارنة بين العلم الحديث والكتاب والسنة) دیاترین ئەو موعجیزە خوابیانەی دیار خستووە لەبوونی شتەکانی دەوروبەر، کە بوونی ئەو شتانە لەبەرژەوەندی مرۆڤەوەیەو هەر باسێکیش بەئایەتی قورئانی پیرۆز یان بەفەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) بەبەڵگە هێناوەتەوە بەخوێنەرانی ئاشنا کردووەو دیاترین لێکۆڵینەوە لەو کتێبەی د.دلاوەر بابەتی (سۆنارو دۆلفین)ە کە لەنووسینەکەیدا ململانێیەکی دیار باس دەکات لەنێوان شاکاری یەزدانیو کاری دەستی مرۆڤ.. ململانێی دروست کردن و ئامێری (سۆنار) لەنایلۆن و ئاسن بەرامبەر بەشاکاری دروست کردنی گیانلەبەرێکی هەستەوەری وەکو (دۆلفین) لەگۆشت و ئێسقان و خوێن.

مەبەستی د.دلاوەریش لەو شیکردنەوانەدا ئەوە نییە، وەکو هەندێ لەگروپە ئیسلامیەکان، بڵێن دروستکردنی سۆنار حەرامە یان شتێکی شیاو نییە، بەڵکو مەبەستەکەی ئەوەیە گەورەیی یەزدان و ماندووبونی مرۆڤ دیاربخات، کە هەرچی بکەین ناتوانین دڵۆپە خوێنێك لەو خوێنەی خۆمان یان ئاژەڵ دروست بکەین.



زانستی پزیشکی و دەرمانسازی گەیشتۆتە ئەو قۆناغەی دەرمانێك لە لەشی (سیسرکە) بۆ نەخۆشی (ئایدز) دروست بکەن

گـەڕان بـەدوای زانسـت و دۆزینەوەی نوێ شتێکی نەشیاو نییە، بەڵکو یـەزدانی مـەزنیش لـەو لایەنـەوە مرۆڤـی هـانداوەو لەقورئانی پیرۆزدا باسی کردووە ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ/ سورة الزمر-٩﴾ ئیدی پـیرۆزی پـەروەردگار لەهـەموو ژیـانی مـرۆڤ و هەڵـهاتن و ئـاوابوونی خـۆرو بوونـەوەرەکانی تـر و هـەموو ڕێسـاکانی ئـەو گێتییـە دەردەکـەوێت. ئێمـەی بـەندەی خـوا لەبـەر ئـەوەی لەبـەردەم شـارکارەکانی پـەروەردگار بێ‌هـێزو ملکـەچین، لـەژیانماندا لەزۆر شت بێزار دەبین و قسەی نابەجێی بـۆ دەکـەین و گوایـە بوونـی ئـەو شتە زیادە یـاخود هەرنەبوایـە، بـەڵام هـەروەکو لەسـەرەوە باسـم کـرد یـەزدانی مـەزن هیـچ شـتێکی لـەزیاد دروست نـەکردووەو جارێکیـان ئەو ڕووداوە بەسەر خۆمدا هات و زۆر جـاران لـەبوونی زیندەوەرێکـی بچووکـی وەکـو (سیسـرکە) بـێزار دەبـووم و خۆزگەم دەخواست کە نەبووایە، بـەڵام جارێکیـان لەکـەناڵی (الجزیـرە)ی ئاسمـانی لـە لێکۆڵینەوەیـەکی بەلگـەداری زانستیدا ڕوونـی کـردەوە کـە زانستی پزیشکیو دەرمانسازی گەیشـتۆتە ئـەو قۆناغـەی دەرمانێك لە لەشی (سیسرکە) بۆ نەخۆشی (ئایدز) دروست بکەن کـە ڤایرۆسـی (HIV) دروسـت دەکات و ناسراوە بە (Aquired Immune Defenshesy Seledrom) ئیدی زۆرتـر یـەقین بـووم لـەوەی پـەروەردگار لـە هەموو داهێنـەرێکی سـەر زەمـین مەزنترە.

هـەر بـەو جـۆرەش چـەندین زانـای ڕۆژئـاوایی لەمیانـەی کارەکانیـاندا ڕاسـتییەکی قورئانیـان بـۆ ڕوون بۆتـەوەو دەست بـەجێ ئیمانیـان بـەخواو قورئان هێناوەو بوونەتە ئیسلام وەکـو ئـەو زانـاو دەریاوانـە ڕۆژئاواییەی باوەڕی بەو ئایەتە هێنا کە دەفەرمووێ: ﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لاَ يَبْغِيَانِ/ سورة الرحمن/٢٠﴾و ﴿هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ/ سورة الفرقان/٥٣﴾ بەهۆیەوە ئیسلام بوو.



﴿ وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَاقَهُ الَّذِي وَاثَقَكُمْ بِهِ ﴾ (سورة المائدة/ ٧)

**یادی ئەو نیعمەتانەی خودا بکەنەوە کە لە عالەمی ئەرواح دا وادەی لێ وەرگرتوون و پابەندی ئەو عەهدو پەیمانەی خودا بن کە بەڵێنی پێ لێ وەرگرتوون.**

تەفسیری ڕەوان، لاپەڕە/ ٣٣٥



# پیرۆزی ئەركی زانای موسڵمانی كورد

قاسم بەرزنجی



﴿شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ﴾/ سورة ال عمران-١٨

صدق الله العظيم

كاتێ باس لەماموستای ئایینیئیسلامی دەكرێت دەبێ هەندێ لەلاپەرەكانی مێژووی گەلەكەمان هەڵدەینەوەو بەرزیو شكۆداری رۆڵی ماموستایانی ئایینی ئیسلامی لەرۆژانی رابوردوو بهێنینەوە یادو بەویژدانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بكەین، چونكە هەر رۆژانێكی كە بەسەر گەلەكەمان رۆیشتبێت جۆرە روداوێك و كارەساتێك لەئارادابووەو گەورە زانایان و كەسانی بلیمەت و خۆراگریش تیایدا ژیاون و، بۆ بەرگری كردن و وەستان بەرامبەر زوڵم و زۆرداری دوژمن و ناحەزان هەردەم قەڵغان بوون و هەریەك بەجۆرە رێبازێك و ئاستێك بەتەنگ كێشەی گەل و وڵاتەكەیانەوە هاتوون.

ماموستای موسڵمانی كورد هەر لەكۆنەوە شانازییان بەكوردایەتی خۆیان و كوردستانەكەیان كردووەو لەپاڵ خوێندن و وەرگرتنی زانستی شەریعەتی پاكی ئیسلامیدا بواری مێژوو ئەدەب و زمانی زگماكی نەتەوەكەیان فەرامۆش نەكردووە، هەرچەند لەتوانایاندا بووبێ هەوڵی بێ وچانیان داوە بۆ بەرەو پێش بردنی بواری ئایینیو رۆشنبیریو كۆمەڵایەتیو بگرە سیاسیش. بۆ ئەم مەبەستەش لەم شوێن و ئەو شوێنی خاكی فراوانی كوردستانی یەك پارچە بە نالەبارترین باری ژیان و تەندروستی گەڕاون و (خۆشەویستیو لەخۆبوردویی) بەمەبەستی جێبەجێ كردنی ئەركە پیرۆزەكەیان دوو خەسڵەتی سەرەكیان بووەو كام ژیانی تاڵ و پڕ مەرگەسات و ئەشكەنجە بووە هەڵیانبژاردووە تەنها بۆ ئەوەی بەسەرفرازی بژین و دوورەپەرێز نەبن لەو ئێش و ئازارو غەدرو زوڵمەی كە لەگەلەكەمان كراوە لەسەردەمی ئەو فەرمانڕەواو ئیمپراتۆرانەی كە حوكمی وڵاتی كوردستانیان لەدەست بووە، لەلایەكی تر تاكو دوژمنان وا هەست نەكەن كە كورد گەلێكی بێ تواناو دەسەڵاتن یاخود خوانەخواستە نەفام و بێ هەستن، نموونەی ئەو ماموستا ئایینییە بەئەمەك و بەرێزانەش ئەوەندە زۆرن كە ئامار كردنیان ئاسان نییە.

تا ئێرە زانیمان كە هیچ گومان لەگەورەیی وەزیفەو هەوڵی زانایانی ئایینی كورد لەرابردوودا نییە، بەڵام ئەوەی ئێمە زیاتر مەبەستمانە رۆڵی پیرۆزی ماموستایانی بەرێزی ئەمڕۆمانە كە دەبێ گونجاو بێت لەگەڵ ئەو واقیعەی ئێستا لەكوردستانی خۆشەویستدا لەئارادایەو چەسپاوە، ماموستا (عەلائەددین سوجادی) لەپەرتوكە بەنرخەكەی (مێژووی ئەدەبی كوردی) لەچەند دێرێكدا باس لەرۆڵی ماموستایانی ئایینی دەكات و دەفەرموێ: (دەتوانین بڵێین ماموستا هەر لەكۆنەوە سوڵتەی تەشریعیو تەنفیزی بووە، لەگوند یا لەشار، بڕیاریان لەسەر هەر شتێك دابێ ئەوە بووەو گەڕانەوەی نەبووە).

كەواتە زۆر بەروونی بۆمان دەركەوت كە ماموستای ئایینی ئەندامێكی زۆر كارامەو بەتوانای كۆمەڵە، لەهەمان كاتیشدا ئەركێكی زۆر گران و پێویستی لەسەر شانە بەتایبەتی لەرۆژانێكی وەك ئیمڕۆ كە گەلی كوردمان بەقۆناغێكی ناسكدا



> مامۆستای كوردی ئایینی ئیسلامی هەر لە كۆنەوە شانازییان بە كوردایەتی خۆیان و كوردستانەكەیان كردووەو، لە پاڵ خوێندن و وەرگرتنی زانستی شەریعەتی پاكی ئیسلامیدا بواری مێژوو و ئەدەب و زمانی زگماكی نەتەوەكەیان فەرامۆش نەكردووە

تیدەپەڕێت و جۆرەها راو بۆچوون و ویست و ئارەزوو سەری هەڵداوە بۆی هەیە زۆر جار بكاتە رادەیەك كە راستی لەخەڵك ون ببێ یا هەر نەبێ گومانی تیا دروست ببێ، كە حەتمەن كاردانەوەیەكی سەلبیانەی وا دێتە ئارا كار دەكاتە سەر ئەو داب و نەریت و بنەمایەی كە كۆمەڵگای كوردەواریمان لەرۆژی بوونیەوە پێوەی پابەندەو لێی جیا نابێتەوە جگە لەوەی كە دژی بەرژەوەندییەكانی گەلەكەمانە لەبەدیهێنانی مافە رەواكانی.

جا ئەگەر رۆڵی مامۆستای ئایینی ئیسلامی وەك جارانی پێشوو یا هەڵوێستی بەرێزیان لەو ئاستە بێت كە هەردەم لەلای هەموو رۆڵەیەكی كورد بە بەرزی نرخێندراوە لەو بڕوایە داین، كە هیچ هێزێكی لابەلاو تێكدەر ناتوانێ تەنها یەكێكیشمان لەخشتە بەرێ‌و پێچ و پەنا لەبەردەم رێگای راستی بخولقێنێ، چونكە بەردەوامی تێكەڵاوی مامۆستای ئایینی لەگەڵ جەماوەرو ئیرشادو وەعزی پڕ بەهاو كاریگەریان دەتوانێ سنوور بۆ هەموو كێشەیەك دابنێ‌و ئەو تیرو توانجانەش رەت بكاتەوە كە دژ بەبەرژەوەندییەكانی گەلە ستەمدیدەكەمانن، لەلایەكی تر هەر لەزووەوە ئەو قەناعەتە لای هەموو مرۆڤێكی كورد دروست بووە كە بڕیاردان و دەربڕینی راو بۆچوونی مامۆستای ئایینی لەسەر هەر كێشەو بابەتێك وەك دەستووری شەرع وایەو خەڵك پێوەی پابەند دەبێ. چونكە هەروەك باسمان كرد مامۆستای خوالێخۆشبوو (عەلائەددین سوجادی) بەدڵنیاییەكی تەواوو دوور لەگومانەوە داكۆكی لەسەر ئەوە دەكات كە بڕیاری مامۆستای ئایینی كۆتاییەو نابێ گەڕانەوەی تیابێ، كەواتە بڕیاردانی مامۆستا بەرێزەكانمان لەسەر هەر دیاردەیەك كە بەراستی‌و دروستی نازانن و دوورە لە بنەماكانی شەرع و دەبێتە سەر لێشواندنی موسڵمانان، ئەركێكی قەتعییەو نابێ نكوڵی تیا بكرێ یا پشتگوێ بخرێ هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ/ سورة الحجرات-٦﴾.**

سەرۆكی هێژا كاك (مەسعود بارزانی) لەكۆنگرەی چوارەمی یەكێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی كوردستان چەند جارێك لەوتە بەپێزەكەیدا داكۆكی لەسەر ئەوە كردووە كە دەبێ مامۆستایانی ئایینی ئیسلامی كوردستان رۆڵی خۆیان ببینن و لەئاست مەسئولیەتی خۆیاندا بن، كەواتە زۆر گرنگ و پێویستە كە مامۆستای ئایینی ئیسلامی كورد رۆڵی خۆی لەو رۆژگارەماندا ببینێ وە یا بەراشكاوانە تر بڵێین رۆڵی جارانیان بگەڕێتەوەو هەمیشە (سوڵتەی تەشریعیو تەنفیزی) بن و خۆیان لەكێشە هەنووكەییەكان بەدوورنەگرن كە فەرامۆش كردنیان زەرەرو زیانێكی زۆریان لەسەر گەلەكەمان و مێژووە پڕ سەروەرییەكەمان هەیە.



# میر محەممەدی ڕەواندوزی و هەوڵێکی سەرنەگرتوو بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی

حەسەن مەحمود کەریم

میرنشینی سۆران لەسەدەی ١٢ی زاینییەوە باس و خواسی هەیە، ئەو کاتەی کە (عیسا کەوڵۆس) قەڵاکانی دەوروبەری گرت و سنووری فراوان کردو شاری (دوین) دەکاتە پایتەخت.. هەتا سەدەی ١٨ی زاینی هەژدە میر حوکم دەکەن، میر عیسا، میر بوداغ، میر سەید، میر عیزەدین، میر سەیفەدین کە پایتەخت لە دوینەوە دەگوازێتەوە بۆ شاری (هەریر)، پاشان میر قولی بەگ، بداغ بەگ، میر سولەیمان، عەلی بەگ، پایتەخت لە هەریرەوە دەگوازنەوە بۆ (خەلیفان)، پاشان ئوغوز بەگ دێت (ڕەواندوز) دەسەنێتەوەو دەیکاتە پایتەختی هەمیشەیی، میرە بەگی برای دێ، پاشان میر ئەحمەد، هەتا سەرە دەگاتە سەر میر ئوغوز بەگ کە شەش کوڕی دەبێ‌و لەساڵی ١٧٦٨ کۆچی دوایی دەکات.

پێش مردنی میرنشین دابەش دەکات بەسەر (مستەفا بەگ و تەمەرخان و یەحیا بەگ و بایز بەگ و ئەحمەد بەگ)ی کوڕیدا.. مستەفا بەگی کوڕە گەورە دەکاتە سەرۆکیان، کەسایەتییەکی زیرەك و بەتوانا دەبێت.. ئەوکاتە بارودۆخی ناوچە شپرزە بوو، براو ئامۆزاکانی چاو دەبڕنە دەسەڵات و ناوچەکانی، هەریەکە پارچەیەکیان دابڕیبوو. مستەفا بەگ زۆر هەوڵیدا براکانی بۆ ڕازی نەدەکرا، لەبەر ئەوەی خۆی پیر بوو، ناچار بوو یەکێ لەکوڕەکانی پێ بگەیەنێ.. چوار کوڕی هەبوو (محەمەدو ئەحمەدو ڕەسوڵ و سولەیمان) میر محەمەدیان زرنگ و وریا بوو، کاری لەسەر کرد، هەر لەمنداڵییەوە خستیە بەر خوێندن.. مزگەوتێکی بۆ دروست کرد (محەمەد ئیبن ئادەم)ی زانای ناوداری کردە مامۆستای، پاشان (ئیبن ئادەم) بووە سەرۆکی حوجرەو زانایانی ناوچەکەو پاشتر بووە موفتی میرنشینی سۆران.. کە میر محەمەد خوێندنی تەواو کرد، ئەنجا کردی بەلێپرسراوی ناوچەی چۆڵە مێرگ، هەتا فێری کاروباری بەڕێوەبردن ببێ..

باوکی پیربوو بوو، وڵاتەکەی بۆ بەڕێوە نەدەچوو، براکانی جارێ بابانیان دەهێناو، دەمێ خۆیان ساز دەکردو کێشەیان دەنایەوە، بابانەکان کۆیەو ڕانیەو هەریریان لێ سەند. تەیمورخان بەگی برای هاودیان و شەمزینانی دابڕی، بایەزید بەگی



**سالی ١٨٢٦ بانگی ئازادی بلند کردو سەربەخۆیی راگەیاندو خۆی ناونا (میر مەنسور) و ئالای هەلکرد ، لەوتاری هەینیدا ناوی دەبرا، عوسمانی روتبەی (میری میران)یان پێ بەخشی**

بـــرای دەشـــتەکانی رەوانـــدوزو ناوچـــەی برادۆســـتیان داگـــیر کـــرد، یـــەحیا بـــەگی برای لەلایـەکی تـرەوە خـەریك بـوو، تەنـها رەوانـدوزو سـەرچیاو دۆلی گەوەران و چۆلە مێرگ بۆ مستەفا بەگ مایـــەوە، بابـــان لـــە نەخشـــــــەدابوون و ئەوەشـــی پـــێ رەوا نـــەدەبینن.. مســـتەفا بـــەگ رێكـــەوتنی ناچـــاری لەگـــەلْ مۆركـــردن.. مـــیر محەمەدی کوری بانگ كـــردەوە و ســـالی ١٨٠٨ کردیـــە مـــیری ســـۆران، ئـــەویش مەرجی دانا کە باوکی دەســـت نەخاتـــە کاریـەوە. لەماوەیـەکی کـــەمدا گۆرانکـــاری زۆری کـرد، هـەنگاوی گـەورەی نـا، هـەموو ســـەرۆك خێلـــەکانی کۆکـردەوەو پەیکـەری نوێـــی دەســـەلاتی میرنشـینەکەی لەسـەر دامـــەزراندن.. بـــەلام مـــام و ئامۆزاکـــانی پشـت گـوێ خســـت، ئەوانیش گلەیی وبناشتی زۆریان کرد، باوکی لەو کردەوانەی میر محەمەدی کوری ناڕازی بـوو، میر محەمـــەد وازی هێنـــاو دەســـەلاتەکەی دایـــەوە بەباوکی، بـەلام براکـانی مستەفا بـەگ هـەروازیان نەهێناو لەفیتنەنانەوەدا بوون، چەند جار بابانیان هێنا، پەلاماری تریان دەدا، مستەفا بەگ ناچار بوو محەمـەد بـەگی کـوری بێنێتـەوە سـەر میرنشـینی سۆران، میر محەمەد مەرجی بۆ باوکی دانایەوە کە دەبێ رەواندوز بەجێبهێلێ و بچێتە دێی (هاودیان) دانیشێ و هـەموو پێویستی بـۆ جێبـەجێ دەکـەم. مستەفا بەگ بەگوێی کرد چویەوە دێی هاودیان کە شوێنی لـەدایك بوون و نزرگـەی باوباپیریان بـوو.. لەوێمایـەوە هـەتا مـرد.. دووبـارە مـیر محەمـەد دەسـتی کـردەوە بـە رێکخسـتنەوەی میرنشـین، سەرەك هۆزەکانی بانگ کردەوە، سوپایەکی پتەوی دامەزراند، یەکەم کاری لەناو بردنی فیتنەی ناوخۆ بوو، سالی ١٨١٥ هێرشی کردە سەر (هاودیـان)و ناوچەی برادۆست و ناوچەی یەحیا بەگی مامیو دەسـەلاتەکانی لـەناوبردن.. بـەم جـۆرە گرفتـی ناوخۆی نەهێشت و خەلکی بەچەترسێن کرد، وەك مامۆسـتا هـەژار دەلـێ ئـەوەی ببزوتـا، برزاوتـی لەچاوی دەکرد، کەس نەیوێرا بجولێتـەوە، ئـەنجا دەستی کردە قایم کردنی سەنگەری ناوخۆ.. یەکەم جار (میرزا محەمەد)ی کردە سەرۆکی نووسەران بۆ نوسینەوەی مێژووی سۆران، ئەو رووداوو بریارو فەرمانانـەی دەردەچـوون، یـان دەرچـوون هـەر لەکۆنەوە هەتا چەندە بەردەوام بوون نووسیانەوەو ناویان نا (مالیخا- وەقائیع نامە)، قەلاو سەنگەری بەهێزی بەدەوری رەواندوزدا لێدا، سێ دەروازەی بۆ شار دروست کرد، دوو بورجی گەورەی بەرزی بـۆ پارێزگـاری دەروازەکـان دامـەزراند، پاشـان کۆمیتەیەکی جەنگی پێنج کەسی پێکهێنا ، خۆی سەرۆك بوو، رەسولْ بەگی بـرای سەرپەرشتیاری



جەنگی بوو، ئەحمەد بەگی برای فەرماندەی سوپا بوو، وەستا رەجەبی کردە بەرێوەبەری کارگەی تۆپ و جبەخانەو دارتاشی گالیسکەو خەنجەرو شمشێر. شوێنێکی بۆ دیاری کرد لەگەرەکی (کاوکۆلان) لەرەواندوز، خان گێلدی لەشاری ورمێوە هێنا بۆ دروست کردنی لولە تۆپ و دارشتنی گولله تۆپ، وەستا برایمی ماویلی کردە سەرۆکی وەستاکانی دروست کردنی قەلاو شورەو سەنگەرو رێگاوبان.. لەماوەیەکی کەمدا سوپایەکی (٥٠) هەزار کەسی پرچەکی دروست کرد، هێزێکی سێ هەزار کەسی تایبەتی بۆ خۆی دروست کرد، بەرگی سەربازو پۆلیس و پاسەوان جیابوون و هەریەکە بەرگی تایبەتی خۆی هەبوو، دەزگایەکی دروست کرد بەناوی نەقیبی بازرگانان، مستەفا ئاغا سەرۆکی بوو، کۆمیتەی سەردارانی دروست کرد، خۆی سەرۆك بوو، دانیشتنی هەفتانەیان هەبوو بۆ گیروگرفتی خەلك، ئەنجومەنی زانایانی دروست کرد بۆ کاروباری ئاینی، ئیبن ئادەم موفتی میرنشین بوو، هەروەك لەسەردەمی باوکیدا موفتی بوو، ئەنجومەنی حەکیمانی پێك هێنا بۆ دارشتنەوەی یاسا، حەوت جۆر سکەی لێدا، ناوی خۆیو میرنشین و ئایەتی بەسەرەوە بوو..

پاش ماوەیەك محەمەد ئیبن ئادەم وازی لەکاری فتوا هێنا، چونکە لەگەڵ میر محەمەددا نەدەگونجا، ئیبن ئادەم زانایەکی بەرزی کوردستان و دەوڵەتی عوسمانی بوو، دەیان کتێبی هەبوو، یەکەم کەس بوو بەکوردی نووسراوەی نووسیو هەندێکەس لۆمەیان کرد لەسەر ئەوە، ئەویش وەلامی کوردانەی دانەوە، رۆحێکی کوردانەو نیشتمان پەروەرانەی هەبوو، هەق و رەق بوو، زۆر دژی خاوەن بیدعەکان بوو، ئیبن ئادەم و مەلای خەتێو مەلا یەحیای مزوری پێکەوە لەبەغدا خوێندویانە لەقوتابخانەی گەیلانی، لەگەڵ ئەواندا ئەوکاتە داود پاشای والی بەغدا قوتابی بووە، کە پاشتر بووە والی بەغدا زۆر رێزی زانا کوردەکانی گرتووە و یارمەتی داون و کاری بۆ ئاسان کردوون، ئەوکاتە (محەمەد ئەفەندی شێخ سلێمانی) لەبەغدا دەژیو خوێندنی تەواو کردوەو نزیك و هاورێی والی بەغدا بووە، کە ئیبن ئادەم وازدەهێنێ، نامە بۆ محەمەد ئەفەندی شێخ سلێمانی دەنێرێت کە لەبەغدا بگەرێتەوە بۆ رەواندوزو پۆستی موفتی میرنشین وەربگرێ، چونکە خۆی لەدایك بووی گوندی (خەتێ)یە لەناوچەی رەواندوز (١٧٧٥). پرس بە داود پاشا دەکات ئەویش پێی خۆش دەبێ هەتا رێگە لەشالاوی شیعەگەری قاجاریەکان بگرێ بۆ کوردستان، ئەم پیاوە پاشتر بە (مەلای خەتێ) دەناسرێ، هەروەها داود پاشا لەگەڵ میر محەمەدی

**(کوردو بەغداو قاهیرە) رێکەوتنیان هەبوو لەسەر یارمەتیدانی یەکتر..**

رەواندوز پەیوەندی خۆش دەبێ هەردووك دژی ئێران و دژی عوسمانی دەبن، یارمەتی ئەو بەهێز بوونەی میرنشینی سۆران دەدات، بەتایبەت کە مەلای خەتێ دۆستی گیانی داود پاشا بووەو ئێستە موفتی میر محەمەدە.

## میر محەمەدو هەولەکانی فراوان بوون

کە میر محەمەد گیروگرفتی ناوخۆیی نەهێشت دەسەلاتی ناوخۆی بەهێز کردو قەلاو سەنگەرێکی زۆری لێدا، ئەنجا بیری لەفراوان کردنی سنووری میرنشینەکەی کردەوە، بەتایبەت، کە



میرنشینەکانی دراوسێی لاوازو
ـکۆك بوون، دەوڵەتی عوسمانیش گەیشتبووە دوا پلەی بێ هێزیو پارێزگاری سنوورەکانی پێ نەدەکرا، هاوکات محەمەد عەلی پاشای والی میسر وڵاتی شامی گرتبوو داوای کردبوو لەمیر محەمەدی سۆران و داود پاشای والی بەغدا کە سنوریان فراوان بکەن و سەربەخۆیی خۆیان رابگەیەنن و، جۆرە هاوپەیمانیەکیان بۆ ئەوە مۆر کردبوو، ئیبراهیم پاشا کوڕی محەمەد عەلی پاشا چەك و یارمەتی سەربازی دەدا بەمیری سۆران، کوردەکانیش یارمەتی سوپای میسریان دەدا لەشام بەمەڕو گۆشت و خواردن، لەلایەکی ترەوە محەمەد عەلی پاشا لەبنەڕەتدا کوردی خەڵکی دیاربەکرەو بەبازرگانی توتن دەچنە ئەلبانیاو نیشتەجێ دەبن و، دەبێتە سەرباز لەسوپای عوسمانیداو پاشان دەبێتە ئەفسەر، کە فەرەنسا پەلاماری میسر دەدا سوپای عوسمانی لەمەکدۆنیاوە دەچن بۆ میسرو دوای ئەوەی سەردەکەون بەسەر فەرەنساو رۆڵی بەرچاوی دەبێ، بۆشاییەکی دەسەڵات لەمیسردا پەیدا دەبێ، محەمەد عەلی وەك کەسێکی هەڵکەوتوو دەسەڵاتی میسر وەردەگرێ، کە شۆڕشێك لەنیوە دورگەو یۆنان دژی عوسمانی هەڵدەستێت،

**چیرۆکی زۆر لەسەر توندو تۆڵی ئیدارەو باری ئاسایشی میر نشینەکەی هەیە، ئەم کارە نەزەری ئێران و عوسمانیو بەریتانیاو روسی راکێشاو وای کرد هەموویان لەنەخشەیەکدا یەك بگرن**

محەمەد عەلی پاشا هەردووکیان دەکوژێنێتەوەو، بۆ ئەوە داوای پاداشت لەسوڵتانی عوسمانی دەکات کە شامی بداتێ، بەڵام ئاستانە دورگەی کریتی بێ سوودی دەداتێ ئەویش قبوڵ ناکات و شامی لێ دەسێنێ، گرتنی شام و پشتگیری میر محەمەد بۆ فراوان کردنی سنورو، کوردبوونی محەمەد عەلی پاشاو نامەگۆڕینەوەیان و، لاوازی عوسمانیەکان هەموو هاندەربوون کە میر محەمەد ئەو هەلە لەدەست نەدات و هەر زوو کۆمەڵێك هێرش ئەنجام بدات. پەلاماری ناوچەی برادۆست دەداو، قەڵای نەولۆس دەگرێ، دوای شەڕێکی خوێناوی، مەرگەوەڕو شنۆو هەریرو خۆشناوەتیو زێبار دەگرێت و خەڵکەکە کۆنترۆڵ دەکات، بەیەك سەعات هەولێر دەگرێ، خەریك بوو کەرکوك بگرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێران هێرشی هێنابوو بۆ سەر سلێمانی، وازی لەکەرکوك هێنا. داود پاشا ئەو سەرکەوتنانەی پێخۆش بوو، دیاری بۆ ناردو نازناوی (پاشا)ی پێ بەخشی. زۆر هەولێدا بۆ گرتنی میرنشینەکانی بادینان و هەکاریو بۆتان و داسنەیی (یەزیدی)، عوسمانیەکان لەبەر لاوازی لە زۆر جێ پاشەکشەیان کردبوو، ساڵی ١٨٢٦ بانگی



ئازادی بڵند کردو سەربەخۆیی ڕاگەیاند. خۆی ناونا (میر مەنسور)و ئاڵای هەڵکرد، لەوتاری هەینیدا ناوی دەبرا، عوسمانی ڕوتبەی (میری میران)یان پێ بەخشی، ئێران دانی نا بەسەربەخۆییدا، خانی موکری و خانی چاری (چەهری)و خانی هەکاری پیرۆزبایی سەرکەوتنەکانیان لێ کرد، والی موسڵ ترسی لێنیشتبوو.

میر محەمەد بەزیرەکیو زەبرو زەنگ ناوچەکەی وەك ماستی مەیو لێکردو ئاسایشی بەرقەرار کرد.. کارەکانی بووە جێی سەرنجی شارەزایانی ئەورووپیو عوسمانیو ئێرانی، هەموو دەیانزانی کە ئەم پیاوە بەم هەموو سوپا زۆرو تۆکمەیەو ئەم زەبت و ڕەبتە لەو سنورە تەسکەدا نایوەستێنێو کاری گەورەی پێدەکات.

داود پاشای والی بەغداو محەمەد عەلی پاشا والی میسر هانی میر محەمەدی ڕەواندوزیان دەدا زیاد لەوە بڕوات و سوود لەو هەلە وەربگرێ، میر محەمەدیش هێزەکەی لا گەورە بوو هان دانەکان پەلەیان پێکردو ویستی میرنشینەکانی بادینان و هەکاریو یەزیدیان و بۆتان بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە.

چونکە ڕووداوەکانی ناوچەکە بەپێی هاوکێشەی تەواوی سیاسی عەسکەری نەبوون، کەس نەیتوانیوە ئاسایشی هەمیشەیی دەستەبەر بکات، چەندین جار عوسمانییەکان و هەرێمی موسڵ و بەغداو میرنشینە کوردییەکان و یەزیدییە داسنەییەکان بووەتە کێشەو هەرایان. پاشان کە شەڕی نێوان عوسمانی و ڕوسیا هەڵگیرسا، یەزیدییەکان دایانە پاڵ ڕوس دژی عوسمانییەکان، خێڵی مزوری کۆمەڵێکی ڕۆشنبیر و ناوداربوون لە میرنشینی بادیناندا، نێوانی میرانی بادینان و مزورییەکان زۆر باش بوو، هەتا دوا میریان سەعید پاشای بادینان چونکە خۆی ناکۆك و لاواز بوو، ڕێزی خەڵکی نەدەگرت، خەریکی دنیا خۆری بوو، نرخی مزورییەکانی نەدەزانی، کە هەستی دەکرد ئەوان ناودارو ماقوڵن، ئیرەیی دەبردو دەیویست لەکەسایەتیان کەم بکاتەوە هەتا دەسەڵاتیان زیاتر نەکات، مزورییەکان ڕێبەری ئایین و خەڵکەکە بوون و زانای مەزنی وەك مەلا یەحیای مزوریان هەبوو کە هاوڕێی مەلا محەمەدی ئیبن ئادەم و مەلای خەتیو داود پاشای والی بەغدا بوو.

مەلا یەحیا کەسایەتیەکی ناسراوبوو، هاوڕێی داود پاشا بوو، ڕووی کردە بەغدا، داود پاشا ڕێزی گرت و بەنامەیەکەوە ناردی بۆ لای میر محەمەدی ڕواندوز، چونکە

**بەگشتی هەموو کورد ئەو کردەوەی میر محەمەدی پێ خۆش بوو، هەستی کوردانەیان بۆی جوڵا، بەڵام میر محەمەد بۆ ئەو پڕۆژەیەی حیسابی دەرەوەی نەکردبوو**

هاوپەیمان بوون (کوردو بەغداو قاهیرە) ڕێکەوتنیان هەبوو لەسەر یارمەتیدانی یەکتر.. ئەوە ئەو کاتە بوو کە میر محەمەد بەدوایدا دەگەڕا.. مەلا یەحیای مزوری ڕووی کردە ڕواندوزو نامەی داود پاشاو داواکاریەکەی خۆی پێش کەشی میر محەمەد کرد، میر محەمەد زۆر ئاسان وەری گرت و دەست بەجێ کاری لەسەر کرد، ٦٠ هەزار سەربازی چەکداری ئامادەکرد، هەر لەم کاتەدا هەواڵێکی مژدە بەخشتر هاتە ڕەواندوز، (موسا پاشا)ی برای سەعید پاشای میری بادینان هەڵهات و خۆی گەیاندە لای میر محەمەدو داوای کرد



یارمەتی بدات هەتا لەدژی سەعید پاشاو ئیسماعیل پاشای برای شۆڕش بکات.. ئەمە هێندەیتر میر محەمەدی سور کرد لەسەر ئەوەی بەهانای هەردوو مەلا یەحیاو موسا پاشاوە بچێو نیازەکانی خۆی جێبەجێ بکات.. سەرەتا داوای لە مەلا یەحیاو مەلای خەتێ کرد فتوای بدەن و ئەو شەڕە هەڵاڵ بکەن.. هەندێ مێژوو نووس دەڵێن مەلای خەتێ فتوای نەدا، چونکە ئەو رووداوە هیچ پەیوەندی بەمیرنشینی سۆرانەوە نییەو، هەڵگیرساندنی شەڕێکی وا خوێنی زۆری لێ دەکەوێتەوە لەدوورو نزیك لەبەرژەوەندی میرنشینی سۆران نییە، هەر چەند دەیزانی کە میر محەمەد زۆر تامەزرۆی ئەو شەڕە بوو بە هەر نرخێك بێت دەکرێت.. بەڵام مەلا یەحیای مزوری کە لەمەلای خەتێ زاناترو ناودارتربوو، خۆی بۆ خۆی فتوایەکی ئامادە کرد پێشکەشی میر محەمەدی کرد، هەندێ مێژوونووسی تر دەڵێن فتواکە مەلا یەحیاو مەلای خەتێ پێکەوە ئامادەیان کردوە.

میر محەمەد سوپای قورس و جبەخانەی ئامادە کرد مەلا یەحیاو موسا بەگ بەنهێنی نامەو راسپاردەی زۆریان نارد بۆ دۆست و هەوادارانیان و لەدژی میرانی بادینان هانیان دان.

میر محەمەد سوپاکەی کردە دوو بەشەوە، سوپای یەکەم بەسەرپەرشتی خۆیو مەلا یەحیای مزوری لەگەڵ بوو چوونە سەر یەزیدیەکان و خراپ شکاندنیان، هێزی دووەم بەفەرماندەی رەسول بەگی برایو موسا بەگی برای بۆ سەر میری بادینان بڕۆن و چاودێری بکەن، ئەگەر سوپای بادینان چوون بۆ یاریدەی یەزیدیان لێیان بدەن.. لەبەهاری سالی (١٨٣٣)دا جەنگی میر محەمەدو یەزیدی تاوی سەندو دوو ڕۆژی خایاندو سوپای یەزیدیەکان تیکشکا. پاشان ئاکرێیان گرت، ئینجا پەلاماری ئامێدی پایتەختی بادینان دراو دوای شەڕێکی قورس گیرا لەدوای ئەوانیش پەلاماری ماردین و زاخۆو نوسەیبین و هەکاریو بۆتان دراو ترس چووە دڵی سوڵتانەکانی عوسمانی لەئەستەمبوڵ.. بەم جۆرە میر محەمەد دەستی گرت بەسەر میر نشینی داسنەیی یەزیدیان و میرنشینی بادیناندا. پیاوی خۆی بۆسەرەوە دانان.

> داوای لە شێخ نورەدین بریفکانی کرد بۆ یارمەتی وتی (انا لا اواجه ظالما بسبب عرض عن الدنیا) واتای بەسەبلێ ئە میری سۆران بارە [illegible]، خراپ دەوری کادی و [illegible].

میر محەمەد ئیدارەی ناوچەکەی دامەزراند، زۆر توند مامەڵەی لەگەڵ دزو جەردەو فتنە گێڕو پیاو خراپ دەکرد، سنوورەکانی توند کرد، کەس نەیدەوێرا خراپەبکات یان بێ مۆڵەت بچێتە سنوورییەوە، چیرۆکی زۆر لەسەر توندو تۆڵی ئیدارەو باری ئاسایشی میر نشینەکەی هەیە، ئەم کارە ئەزەری ئێران و عوسمانیو بەریتانیاو روسی راکێشاو وای کرد هەموویان لەنەخشەیەك بگەڕێن، یترمەتیش لەمێزە ناوچەییەکان وەربگرن..

بەگشتی هەموو کورد ئەو کردەوەی میر محەمەدی پێ خۆش بوو، هەستی کوردانەیان بۆی جولا، بەلام میر محەمەد بۆ ئەو پرۆژەیەی حیسابی دەرەوەی نەکردبوو، دۆستی گەورەی هەمیشەیی پەیدا نەکردبوو، بەریتانیا هۆشیاری بەعوسمانیدا کە بکەوێتە خۆ، دەنا خراپتری بەسەر دێت ، بۆ ئەوە بەریتانیا یارمەتی زۆریدا، چونکە ئەو رووداوە نوێ یانەی ناوچەکە لەبەرژەوەندی ئەو



نییـــەو (خـــط المیـــاه الامـــبراطوري) دەکەوێتـــە خەتـــەرەوە، کـــە چالاکییـــە بازرگانییـــەکانی‌و سەربازییەکانی لەو ڕێیەوە ئەنجام دەدا..

سوپای ئنکشاری یەکێك بوو لە هۆی لاوازبونی دەوڵەتی عوسمانی.. سوڵتان مەحمودی عوسمانی ١٨٠٨-١٨٣٩ زۆر کۆشا هەتا ئینکشاری لەناو برد و سوپای نیزامی دروست کرد بۆ گێڕانەوەی مەرکەزیەت بۆ هەموو ویلایەت و هەرێم و میرنشینەکان، کە جیا بوونەتەوە یان سەربەخۆییان ڕاگەیاندوە یان گوێ بەفەرمانی ئەستەمبوڵ نادەن وەك جەلیلەکان لەموسڵ و داود پاشای مەمالیك لەبەغداو شەمەر عەشابوری لەباشووری عیراق و شام و میسرو نیوەدورگەو زۆر لەمیرنشینە کوردییەکان.. سەرەتا بەریتانیا نەخشەیەکی بۆ دارێژاو بەهۆیەوە توانی فیتنە بخاتە ناو شام و، میسر بەداگیرکەر بزانی‌و عەشایەرێکی زۆر سەرەك عەشیرەتەکان، کردیان بەلێپرسراوی بەغداو موسڵ و حەڵەب و دیاربەکر بۆ ئەوەی بەقورسی لێ نەوێ، چونکە جاران ئەو سنووورە فر اوانە دەدرایە چەند کەس، هەر لەحەڵەبەوە بە ١٠ هەزار کەسەوە، ڕێکخراو بەتۆپخانەی قورسەوە هاتە موسڵ، لەوێ بوونە ٢٠ هەزارو هەر لەوێوە هەموو میرنشینە کوردەکان و خەڵکی دیکەی ئەهوەن کردەوەو وتی تەنها نیازی بەغدام هەیەو داود پاشا لەناو دەبەم.. لەبەختی ئەو لەبەغدا تاعون داکەوتبوو خەڵکی زۆر مردبوون، ئاوی ڕووباری دیجلە هەستابوو لافاوی کردبوو، لەبەر ئەوە بەغدا زۆر ئاسان گیراو داود پاشا هەڵهات.. بەم جۆرە هەردوو پاڵپشتەکەی میر محەمەدی ڕەواندوزی لەمیسرو شام و داود پاشای بەغدا نەمان.. عەلی ڕەزای لاز سەرەتا ئەفسەرێکی بەناوی (محەمەد ئینجە بریقدار) کە دوژمنێکی سەرسەختی کورد بوو.. کردیە والی شارەزوور،

**بەریتانیا دەترسا دوو هێزی تازە نەبن میر محەمەدی ڕەواندوز و میر عەلی پاشای میسر کە هەردوکیان کوردن یەکبگرن خرابی لێ بکەوێتەوە**

بەهاندانی بەریتانیا لەسوپای محەمەد عەلی پاشا هەڵگەڕانەوەو شەڕێکی ناوخۆیی قورس ڕووی‌داو لە زۆر شوێن سوپای میسریان ڕاوناو ناچاریان کرد ڕێکەوتنی (کوتاهی) لەنێوان عوسمانی‌و میسردا ببەسترێت و شام گەڕایەوە ژێر دەستی عوسمانی، ئەنجا نەخشە دارێژرا بۆ گێڕانەوەی بەغداو عێراق، ئەمەیانیان سپاردە (عەلی ڕەزای لاز) چونکە لای عێراقییەکان ناسراو بوو پەیوەندی بەناودارو سەرەك عەشیرەتێکی زۆرەوە هەبوو، پێشتر ئەزمونی لەگەڵیان هەبوو.. عوسمانییەکان ٦ هەزار کیسە پارەیان دایە بۆ خەڵەتاندنی میرو واتە هەر لەموسڵەوە هەتا سلێمانی بۆ گێڕانەوەی میرنشینە کوردەکان بوو، ئەم سەرەتا کەوتە وێزەی یەزیدییەکان، چونکە لەشەڕی عوسمانی‌و ڕوسیدا دابویانە پاڵ ڕوسەکان و ئەرمەن، لەبەر ئەوە دەیان هەزار یەزیدی کوشت، پاشان کەوتە وێزەی میر نشینە کوردیەکانی تر بەتۆپ هەموو شارەکانی میر نشینەکانی بۆتان و هەکاری‌و یەزیدیانی بێژاو گێڕانیەوە ژێر دەستی عوسمانی. سوپای میر محەمەدی ڕەواندوزی لێ دەرکردن.. ئەنجا ڕەشید پاشا دانرا کە کاری میر محەمەدو میرنشینی ڕەواندوز تەواو بکات، ڕەشید پاشا پیاوێکی



سەربازی توند بوو لەشەڕی شامدا کەوتبووە دەستی سوپای میسرو، زۆر نییە بەردراوەو کراوەتەوە بە والی سێواس، (ڕەشید پاشا) عوسمانییەکان گلەییان لێی هەبوو لەشەڕی شامدا، بڕیاریدا لەشەڕی کوردستاندا خۆی پاك کاتەوەو گلەیی لەسەر خۆی نەهێڵێ.. ڕەشید پاشا سوپایەکی ٤٠ هەزار کەسی ئامادەکرد بەهەموو پێویستییەکی تۆپ و جبەخانەوە، چەند هێرشێکی کردە سەر سوپای میر محەمەد، بەڵام زۆر خراپ شکاو گەڕایەوە بۆ موسڵ، ویستی سوود لە زانا کوردەکان وەربگرێ میر محەمەد ناشیرین بکات، پارەیەکی زۆری ڕشت و جاشێکی زۆری پەیداکرد، داوای لەشێخ نورەدین بریفکانی کرد بۆ یارمەتی وتی (انا لا اواجه ظالماً بسبب عرض عن الدنیا) وتیان قسە بڵێ بەمیری سۆران پانزە دێهاتت دەدەینێ، خراپ دەری کردن و نەیکرد.. ئەمجارە لای زابی گەورەوە هێرشی تری کرد، دووبارە میر محەمەد زۆر خراپ شکاندی.. لەداخان زانایەکی زۆری بەفێڵ بانگ کردو لەنزیك شێخان هەموویانی کوشت، ئەمەیان نەخشەی محەمەد ئینجە بریقدار والی موسڵ بوو بۆ چاوترساندنی کوردەکان، کوردەکان لەرقی ئەو کارە لەسەربازگەی موسڵدا ویستیان بریقدار بکوژن.. بەڵام سەری نەگرت و دەربازی بوو.. ئەمجارە بەریتانیا هاتە مەیدان و نەخشەی جەنگی بۆ دارشت و داوای لەروسیاو ئێرانیش کرد بەشداری بکەن.. بەریتانیا دەترسا دوو هێزی تازە نەفەس میر محەمەدی ڕەواندوزو میر عەلی پاشای میسر کە هەردوکیان کوردن، یەکبگرن، خراپی لێ بکەوێتەوە، دەترسا ئەو دوو محەمەدە کوردە نەخشەی ناوچەکە بگۆڕن و (هێڵی ئاوی ئیمپراتۆری بەریتانی) کە سەربازیو بازرگانی بوو بۆ هیندستان و باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بکەوێتە خەتەرەوە، ئەوەبوو محەمەد عەلی پاشای بردەوە میسرو شامی لێ سەندەوە، لەمیسر هێشتیەوە هەتا بەری هێرشی فەرەنسای پێ بگرێو بیکاتە کارتی فشار بەدەستی خۆیەوە بۆ دژی عوەسمانییەکان لەکاتی پێویستیدا، ئێستەش نەخشەی هەیە بۆ میر محەمەدی ڕەواندوز کە ئەو هێزەی لەناوبەرێو ناوچەکەی لێ بسێنێتەوە، بەڵام هەر بیهێڵێتەوە بۆ کاری داهاتوو بۆ دژایەتی ئێرانی قاجاریو کارتی فشار دژی ئێران..




فرانگیل دەڵێ: وڵاتە ڕۆژئاواییەکان یارمەتی دەربوون بۆ لەناوبردنی میر محەمەد، بەریتانیا (ئارگوییە) پسپۆری جەنگیو (پیتێن) پسپۆری ئەندازیاری جەنگیو چەند پزیشکێکی نارد بۆ جێبەجێ کردنی نەخشەی عوسمانییەکان.. سوپای ڕەشید پاشای کردە دووبەش، یەکیان لەباکوورەوە بچێ بەرەو ڕەواندوز، ئەوی تر لەڕێی ئاکرێ وە بچێت بەرەو ڕەواندوز، بەڵام هەردووکیان شکان و نەخشەی بەریتانیا سەری نەگرت.. ئەمجارە سوپایەکی زۆری لەموسڵ و کەرکوك و بەغداوە بە تۆپ خانەی قورسەوەو بەکوردێکی زۆر لەمیرانی دژی میر محەمەد نارد شارو دێو کشتوکاڵی سەر ڕێگەیان سوتاندو قەتڵ و عامێکی قورسیان ئەنجامدا، هەموویان لەدەشتی هەریر یەکیان گرت، میر محەمەد ناچاربوو سوپاکەی بکشێنێتەوە بۆ گەلی عەلی بەگ و لەشاخە سەختەکان سەنگەر بگرن، جاشێکی زۆری لەکورد



لەتولـە ڕێگەکانـەوە نـاردو سوپاکەشـی کـردە دووبـەش، بەشێکیان بەخـەلیفانداو بەشـی دووەم بەڕێگـەی (سـپیلك)دا نـاردە ئـەودیو کـە دەڕوانـێ بەسەر دەشتی سۆران و ڕەواندوزدا، میر محەمـەد لەم کاتـە ناسازەدا کـارێکی زۆر خراپـی کـرد، لـە ١٨٣٤دا پەلاماری بردە سەر ئێران و سـوپای فەتح شای قاجاری شکاندو لاهیجان و موکریانی گرت.. کـە زانـی زۆری بـۆ هـاتووە، ئـەنجا دەسـت و دیاریەکی زۆری نارد بۆ حاکمی ئێران هـەتا بگاتە فریای، ئێران دیاریـەکانی وەرگرت، بـەلاّم وەلاّمـی نەدایەوە، چەند میری کوردی یاریدەدەری ڕەشید پاشـا بـوون وەك (محەمـەد مەسـرەفی، مـەحمود خۆشـناو، بایـەزید بـەگ کـە چاوسـاغی ڕەشـید پاشابوو، دەیانیتر..) میر محەمەد گەمەی سیاسی نەدەزانی، یان کاتێ کردی ویستی سود لەناکۆکی ئـێران و عوسمـانی وەربگرێـت، سـەرەتا پـەلاماری دەدات، ئەوسـا تـەنازولی بـۆ دەکـات کـە زوتـر وەرەقەکـە بـەریتانیا بـۆ بـەرژەوەندی عوسمـانی کڕیبووی، میر محەمەد حیسابی پێشووی بۆ ئێران نەکردبوو.. میر محەمـەد دەیزانـی ئـەو هـێزەی کە بـۆی هـاتووە، هـەتا لـە نـاوی نـەبات وازنـاهێنێ، سەنگەری لە گەلی عەلی بەگ و ڕێگەی سپیلك بەهێز کرد قەلاّکانی چواردەوری ڕەواندوزی قایم کرد لە هەموو لاوە بەربوونە هێزەکانی عوسمانیو هەرایان پێکردن، نەخشـەیان داڕشتبوو کـە پـەلاماری ئـەو هـێزە زۆرەی عوسمـانیو بـەغداو موسـلّ بـدەن کـە لەدەشتی هەریر مۆلّ خواردبوو، بەلاّم نـەیوێرا هێز دوورخاتەوە، هەموو ڕێگاکانی ڕەواندوزی بەست، ڕەشید پاشـاش هـەر خـۆی دوادەخـست و نـەیوێرا بچێتە جـەنگی تـەواوەوە، چونکـە لێدانـەکانی میر محەمـەدی چەشـتبوو، ویسـتی بەگـەمارۆدان بیپسـێنێ.. ڕەشـید پاشـا زۆر سـودی لـە نـاکۆکی نێـوان سـەرەك خێڵـە کوردەکـان دەبینـی.. ئـێران بـەداوای بـەریتانیا بڕیـاریدا بێتـە بازنـەی جەنگـەوە دژی ڕەوانـدوز، ئـێران دە هـەزار سـەرباز‌ی بـەرە و سـنوری سـۆران هێنـا، بـەریتانیا (شـیل)ی نوێنـەری خـۆی لەتـەورێزەوە نـارد، بـاڵیۆزی بـەریتانیا لـەتاران (ئیلیـس) داوای لەشـیل کـرد کـەوا لەرەشید پاشـا بکـات لەگـەلّ ئێران پێکەوە لەمیری سۆران بـدەن، روسـیاش هـەمان هەلّوێسـتی هـەبوو، عوسمانییـەکان بڕیاریـان دا زەرەری ئێران لەپەلامارەکانی میر محەمەد بۆ ناوچەی ورمێ ببژێـرێ، ئـێران لەتـەبرێز داوایـان لەکونسـوڵی روس (کۆدنێس) کرد بە تۆپ دژی مـیری سـۆران یـاریدەی سـوپای ئـێران بـدات، ئەوانیش لەئەمباری خواروی روسیا ١٥٠٠ گوللە تـۆپ عـەیاری ٢٤و، ٣ هـەزار گوللـە عـەیاری ١٤ یان دا بە سوپای ئێران، بەمە ڕۆژهەلاّتی میرنشینی سـۆرانیش گـەمارۆی تونـد درا، مـیر محەمـەد ئـەم هەموو نەخشەو هاوکێشە لێك گرێدراوانەی بیست، کە هـەرگیز پێشبینی نـەکرد بوو، نـەیدەزانی چـی چـاندووەو، چـۆن ئـەو هـەمووەی بەئاسـانی بـۆ چووەسەر.. چەند هێرشێکی ڕەشید پاشا خـراپ شکێنرا، کە دەیوست لەرەواندوز نزیك ببێتـەوە.. ڕەشید پاشا بـۆی دەرکـەوت دەبـێ بەئاشتی ئـەم کێشـەیە ببڕێنێتـەوە دەنـا زیـانی هێجگـار زۆر دەبێت.. میر محەمەدیش بۆی دەرکـەوتبوو ئەگـەر وابڕوات سـۆران بـەمیرو گـەدا تیـادەچێت، (فـۆن

**پاشای کۆرە داوای لە (مەلای خەتێ) کرد فتوای ڕاگرتنی شەڕو ڕێکەوتن بدات**



مۆلدکه) دەلێ: بۆ گرتنی هەر قەلایەك سی تا چل ڕۆژی دەویت.. میر بیری دەکردەوە لەهەلێکدا گفتوگۆ لەگەل عوسمانییەکان بکات، هەر لەو دەمەشدا رەشید پاشا نامەیەکی بۆ محەمەد پاشای رەواندوز ناردبوو تیایدا هاتبوو: من وادەبینم شەڕ نەکەیت، دەنا تووشی زەرەرو زیانێکی زۆر دەبی، بەلێنت دەدەمێ ئەگەر خۆت بەدەستەوە بدەی وا دەکەم بابی عالی (ئەستەمبول) بتبووریێو عەفوت بکات، بشتکاتەوە بە میری سۆران، بەخەلات و دیاری و میری سۆرانەوە دەگەڕێیتەوە بۆ سۆران، ئەنجا سەرکردەکان لەو نامەیان کۆلیەوەو رایان هاتە سەر ئەوەی ڕێکەوتن لەسەر ئەو مەرجانە لەهەموو شت چاکترە، میر داوای کرد ئەم باسە رابگەیەنرێ هەتا خەلك ئاگاداربێت، پاشان پاشای کۆرە داوای لە (مەلای خەتێ) کرد فتوای راگرتنی شەڕو ڕێکەوتنی بدات، چونکە بۆ هەموو کارێکی گرنگ دەبوو فتوا بدرێ، ئەویش بەداوای میر دەبوو نەك موفتی میرنشین، فتواکەش بڕیاری حکومەت بووەو مەلای خەتێ لەسەری رازی بووە بەم جۆرە (بەفەرمانی میرو بۆ بەرژەوەندی میرنشینی سۆران ئەوا فتوامان بەراگرتنی شەڕ لە نێوان سۆران و سوپای عوسمانیدا..) فتواکە بەزۆر جۆر نووسراوە، بەلام بەڕای من ئەمەیان لەگەل بارودۆخەکەدا نێزیکترە.. ئەنجا میر محەمەد پاشای کۆرە (ئەحمەد بەگ)ی برای کردە وەکیلی خۆیو لەگەل مەلای خەتێدا چوونە هاودیان لەگەل رەشید پاشا کۆبوونەوە، رەشید پاشا زۆر ڕێزی لێنان و بەلێنی دایە کە هیچی بەسەر نەیەت، محەمەد پاشا چووە ئەستەمبول، سولتان میری عەفوکردو بەمیری سۆران داینایەوە، بەلام لەگەڕانەوەیدا لەرێگە ون دەبێت و نازانرێ چی بەسەر دێت. دەلێن بەفێلی عەلی رەزای والی بەغدا کە زۆر دوژمنی کوردبووە تیاچووەو بزربووە، سەرچاوەکان چیرۆکی زۆر دەگێڕنەوە.. زۆر کەس بەئەنقەست مەلای خەتێ تاوانبار دەکەن، بەلام زۆری دیکە دەلێن مەلای خەتێ دوژمنی دەولەتی عوسمانی بووەو هەر ئەوەندەی کردووە، فەرمانی میر محەمەدی جێبەجێ کردوە وەك هەموو فەرمانێکی دیکە.. جگە لەوە ئەو رازی بوونە چاکترین چارە بووە لەو کاتەدا، چونکە لەناوچوونی خەلکێکی زۆر لەناو ئەو گەمارۆو برسیو تۆپ و سوپایەدا شتێکی حەتمی بوو، رەنگە میر محەمەد خۆی کردبێتە قوربانی خەلکەکەی، بەو هەموو هێزو تۆپخانەیەی عوسمانیو ئێران و روسیو بەغداو موسلی نەدەوێرا کە هەر هەمووی بەنەخشەی بەریتانیا جێبەجێ دەکرا.. مامۆستا مەسعود محەمەد لەبارەی روخانی میرنشینی سۆرانەوە نووسیویەتیو دەلێ: مەلای خەتێ یەکێکە لەزانایانی گەورەی کورد، هەر خۆیشی مامۆستای زۆر لەزانایانی ئایینی ئەو سەردەمە بووە، مەدرەسەکەش مەدرەسەی فەتوای میرنشینی سۆارن بووە، بەپێی ئەحکامی شەرعی کاری کردووە، نەك تەنها مرۆڤێکی پاك بووە، بەلکو تا بلێی کورد پەروەرو دلسۆز بووە، ئەوەندەی لەتوانایدا هەبووە، پارێزگاری لەدەولەتی پاشای گەورە کردووە، خزمەتێکی زۆری میللەتەکەیو میرنشینی سۆرانی کردووە بەدرێژایی سالانی میرنشینەکە مەرجەعی ئایین بووە، مەسەلەی فەتواکەش ئەو کاتە هاتە گۆڕێ کە حسێن حوزنی موکریانی کتێبەکەی خۆی چاپ کردەوە، پێش کتێبەکەی حسێن حوزنی ناووباوی فەتواکەی مەلای خەتێ هەرنەبووە.. لەو کاتەدا حسێن حوزنی هەفتەی جارێك سەردانی (مەلا ئەفەندی) دەکات، لەیەکێ لەسەردانەکانی بۆ لای مەلا فەندی نوسخەیەك لەکتێبە نوێیەکەی خۆی پێشکەش



دەكات، پاش ئەوەی كە مەلا فەندی كتێبەكەی دەخوێنێتەوە بە سەید حسێن حوزنی دەڵێ: هەی بێ قەزابی، تۆ ئەو غەدرەت بۆ لە مەلای خەتێ كردووە، ماقوڵ نیە.. عەبدوڵلا موخلیس بەگ كە خەزوری مەلا فەندی بوو، یەكێكیش بوو لەحەفیدانی برایەكی پاشای كوێرە، پێی وابوو فەتواكە بەتەكلیف و لەسەر رای هەموو بنەماڵەی پاشا كوێرە بووە، بە ئەحمەدپاشاو هەموو براكانی تریشەوە، ئەوان هەموو رازی بوونە ئەوجا فتواكە دراوە.. بۆیە پێم وایە مەسەلەی خیانەتی ئەو مرۆڤە بەر لەكتێبەكەی حسێن حوزنی لەگۆڕێدا نەبووە.

عەبدولفەتاح عەلی یەحیای لێكۆڵەری مێژوویی دەڵێ: حسێن حوزنی موكریانی هەرچی نووسیوە بەبێ سەرچاوە بووەو هەر لەدەمی خەڵكی وەرگرتووە، بەڵێ چووەتە رەواندوز، بەڵام دوای ٨٧ ساڵ بەسەر لەناوچوونی پاشای كوێرەدا..

نووسەرێكی ئەڵمانی لەگۆڤاری روناكبیری سویدی ژمارە (٢) دەڵێ: نازانم بۆ زۆربەی رووناكبیرانی ئەمڕۆی كورد دەست لەبەرۆكی قسەكانی حسێن حوزنی بەرنادەن.

**سەرچاوەو پەراوێز:**


١-شەرەفخانی بدلیس- وەرگێر- هەژار موكریانی- نەجەف- ١٩٧٢.

٢-مێژووی میرانی سۆران-حسین حوزنی موكریانی- هەولێر- ١٩٦٢.

٣-كوردو كوردستان محەمەدئەمین زەكی- مهابات.

٤-مێژووی كورد لە كۆنەوە تا ئەمرۆ- ساڵح قەفتان- بەغداد ١٩٦٩.

٥-كوردەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی- د.جەلیل جلیلی- وەرگێڕانی- كاوس قەفتانی- بەغداد ١٩٨٧.

٦-تاریخ العراق بین احتلالین- عباس العزاوی.

٧-بنەماڵانی بەناوبانگی رەواندوز- مەمدوح مزوری- هەولێر ١٩٩٨.

٨-بابان سۆران بۆتان- د. كاوس قەفتان- بەغداد- ١٩٨٥.

٩-تاریخ العراق الحدیث د.عبدالعزیز نوار- القاهرة- ١٩٦٨.

١٠-اماره بهدینان- صدیق دملوجی- موسل- ١٩٥٢

١١-الیزیدیه- صدیق دملوجی- موسل

١٢-الاكراد فی بهدینان- انور المائی- دهۆك ١٩٩٩

١٣-اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث- لونكریك- ترجمة جعفر الخیاط- بغداد.

١٤-گۆڤاری كاروان ژمارە ٥٢-٨-٢٣-٢٧.

١٥-گۆڤاری زۆزگ ژمارە ١ كانونی دووەم ١٩٩٩.

١٦-گۆڤاری روناكبیری ژمارە ٢ ستوكهۆلم- فازیل كەریم.



# نــــاو

نووسینی
عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی

**لەگەڵ ئەوەی ئەم وشەیە لە چەند پیتێکی کــەم پێکـهاتووە بەڵام هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرەی گرتۆتە ژێر باڵ، شت نییە لەم ژینگەیە بۆ جوداکردنەوە ناوێکی تایبەتی خۆی نەبێ.**

## واتای (ناو)

یەکــەم پێناســەی هــەموو بوونەوەرێکە، هەر لەگەورە تاکو بچـووک، بۆیــە (نــاو) بــەپیرۆز تریــن و دڵســۆزترین هــاوڕێو لکاوەی هــەموو شــتێك لەقەڵــەم دەدرێــت. هــــەر بەبۆنـــەی پیرۆزیــەتی (خـــوای گـــەورە) نزیکـەی سـەد نـاوی شـیاوو خـۆش و پـڕ مانـای بـۆ خـودی خۆی هەڵبژاردووە، هەریەکێ لەو ناوانــە تــەعبیر لــەجۆرێك لەدەســـەڵات و لێــــهاتوویی و ڕەوشتە جوانەکانی خۆی دەکات.

دەیـەها نـاوی خـۆش و پـڕ مانای بۆ پێغەمبەر(د.خ) دیاری کردووە.

هەر ناوە هـەموو بوونـەوەرێك پـەلکێش دەکـات و دەیخزێنێتـە نــاو ســنووری چوارچێـــوەی تایبەتی خۆی.

هــەمــوو لەدایــك بوونێـــك (داهێنــانێك)، دەبــێ ناولێنــانی لەگەڵ بێ، هیچ شتێك لەم کەونە نییە بەبێ ناو بێ. خەڵکی بەهۆی (ناوە)وە هەموو شتێك دەناسنەوەو لێکیان جودا دەکەنەوە.

هــەر کــە گوێبیســتی نــاوی بوونەوەرێك دەبن، ئەوا یەکسـەر شــێوەو قــەوارەو دەقــی ئــەو بوونــەوەرە دێتــە بــەرچاویان و دەیانناسنەوە.

بۆ ڕێزلێنان لەناو، گەلانی ئەم جیهانە تەقەلای ئەوەیان داوە کە ناوی پڕ مانـاو شـیاو، بـەزمانی پاراوی خۆیان بۆ شتەکان دیاری بکەن، تەقەلای قەرەبۆکردنی ناوە نامۆکانیان مەبەست بووە، واتــە ئــادەمیزاد بەرپرســە بــەدیاری کردنی ناوی گشت بوونەوەرێك، هەر گەلێك بەزمانی خۆی. هەموو گــەلانی ئــەم جیهانــە، شــانازی بەکەلــەپوری خۆیانــەوە دەکــەن، ناویش یەکێکــە لــەو کەلەپورانــە بۆ بەڵگە (عەرەب شانازی بەناوی -قــەعقاع-ەوە دەکــات، فــارس شانازی بــەناوی -ڕۆســتەم-ەوە دەکات، کــورد شــانازی بــەناوی -سەلاحەددین-).

ئێمــەی کــورد، دەیــان و هــەزارەها نـاوی خـۆش و شـیاوو پڕ مانامان هەیە، لەم جۆرە ناوە، چــەندین شــوێن و چیـــای وڵاتەکەمانی گرتۆتەوە.

لەو نــــاوە خۆشمـــــانە (کێوەڕەش، گوڵە حاجیلە، کانی بــەرمالان، شـۆڕەبی، گڵــەزەردە، ئاوە باریکە، کانی چنار).

هــەر کە ئـادەمیزاد ئـەم جـۆرە ناوانـەی بـەرگوێ دەکـەوێ ئـەوا یەکسـەر دەزانــێ کــە (چیایەکــە ڕەشــە، یــان کانیەکــە کەوتۆتــە دامێن ماڵـەکان، یان پـەل و پـۆی دار بییەکــە ســەرو خــوار شــۆڕ بۆتــەوە، یــان ڕەنگــی خاکەکــە زەردە، یان ئاوەکە لەجیاتی پان بێ باریکە).

ئەمانــــەن نــــاوی ڕەســـــەنی نەتــەوەی کــورد، خۆیــان دەبنــە هۆی پێناسە کردنی خۆیان.



بەلام، نابێ ئەوە لەیاد بکەین، کە چۆن ناوی خۆشمان هەیە، ئاواش هەزارەها ناوی نامۆو بیانی خۆی خزاندۆتە ناو ناوانی ئەم گەلە، هەر لە ناوی (عەرەبی و تورکی و فارسییەوە تاکو ناوی بەشێك لەگەلانی ولاتی دوور ولات).

بەهۆی ئەوەی ئەم خاکە سەدەها ساڵە بۆتە جێی رمبازێنی ئەو گەلانە، ئەمە بوو بەهۆی مانەوەی ئاسەواریان لەدەیەها بواری ئەم ولاتە، تەمەنی هەندێ لەو ناوانە، دەگەرێنەوە بۆ سەدەها ساڵ لەمەوبەر، زۆربەیان لەگەڵ مێژووی ئەم گەل و خاکە تێکهەلکێشبوونە دەستکاریان هەروا کارێکی سانا نییە، ئەوەندە لەمێژە کەوتوونەتە ناو ئەم گەلە، کاری هەلبژاردنیان بەمەبەستی قەرەبووکردنی زۆر کارێکی دژوارە، ماندووبوونێکی زۆری دەوێ. هەندێ لەو کەسانەی کە هەلگری ئەو جۆرە ناوانەن حەز لە گۆرینیان ناکەن، بەلام ئەگەر هات و بەرێکەوت لەکەسێکت پرسیی و وتت: (ناوەکەت مانای چییە..؟)

ئەوا زۆر بەراشکاوی و راستەوخۆ لەوەلامدا دەلێ: (بەخوا خۆشم بەتەواوی نازانم).

لێرەدا، پرسیارێك خۆی فەرز دەکات:

باشە تاکەی بەم شێوەیە بین..؟

ئەم جۆرە گرفت و کێشانە، تەنها گرفتی نەتەوەی کورد نییە، بگرە بەشێکی زۆری گەلانی ئەم سەردەمەی جیهان پێوەی تلاونەتەوەو بەدەستیەوە دەنالێنن.

بەلای منەوە، کاتی ئەوە هاتووە، یەك دەستە ئەم گەلە نەخشەیەك قەرەبوونی ئەو جۆرە ناوانە دارێژێ و دەست بەکار بێ بۆ بژار کردنیان و دورخستنەوەیان لەم سنوورە.

ئەوەی پێویستە بەپلەی یەکەم هەنگاوی بۆ بنێین ناو لێنانی نەوەکانمان، بەناوێکی کوردی رەسەن، لاوانی ئایندەی ئەم نەتەوەیە پیاوانی ماندوونەناسی دوارۆژی ئەم خاکە، تاوانیان چییە، ناوەکانیان ناخۆش بێ؟ بۆ پاشەرۆژ شەرم لەناوەکانیان بکەن؟ با لەئەمرۆوە، ناوی کوردی رەسەن بۆ (نەوەو شەقام و گوندو دەزگاو قوتابخانەو مزگەوت و شوێنەکانی بژێومان) بنەین ئەم هەنگاوەش پێویستی بەهاوکاری کردنی سەرجەم چین و توێژەکانی گەل هەیە، لەهەمان کاتدا بەهەنگاوێکی فرە کەسی (هەرەوەزی) دادەنرێ.

**بۆ ریزلینان لەناو، گەلانی ئەم جیهانە تەقەلای ئەوەیان داوە کە ناوی پر ماناو شیاو، بەزمانی پاراوی خۆیان بۆ شتەکان دیاری بکەن**

**با واز لەناوی (شەهرام و بەهرام و مامەرو تەمەرو ستی) بێنین.**

**با نۆرەی ناوی (هێمن و بەختیارو هۆشیارو کامەران و سەربەست)بێ**



# ئەوەی پێویستە بە پلەی یەکەم هەنگاوی بۆ بنێین:

## (ناو لێنانی نەوەکانمانە بەناوێکی کوردی رەسەن)

بەشداری سەرجەم چینەکانی گەل، بنەمای سەرەکی سەرکەوتنی ئەم هەنگاوەن.

با زانایانی ئایینیو مامۆستایانی بەڕێزو هونەرمەندان و کاربەدەستان و پیاو ماقولان و رۆشنبیران و قوتابیان و لاوان و کرێکاران، دەست لەناو دەست نێن بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم گرفتەو چەسپاندنی هەنگاوی نوێی داهاتوو.

با هەر یەکێك لەئێمە، لەخێزانەکەیەوە دەست پێبکات با هەستی نەتەوایەتیمان ببزوێو چارەسەرێك بۆ ئەم گرفتە بدۆزینەوە.

با هەموومان هاوسەنگەر بین بۆ چەسپاندنی ئەم هەنگاوە نەتەوایەتییە.

دڵنیام لەئایندەیەکی نزیك خایەن، هەنگاوێکی گەورە لەم بوارەدا دەبڕین.

واتە ئەم ئەرکە، بەئەرکێکی نەتەوەیی رەسەن لەقەڵەم دەدرێو بەزۆری جێبەجێ کردنی، دەکەوێتە ئەستۆی رۆشنبیران.

ئەگەر بێت و، تۆزقاڵێك لەو گۆڕانکاریانەی کە هەن لەبوارەکانی (خانووبەرەو کۆشك و تەلارو جل و بەرگ و کوچەو کۆڵان شەقام و هۆیەکانی گواستنەوەو هۆکارەکانی راگەیاندن و پەیوەندی.. هتد).

ئەمانەو دەیەها شت لەشێوەی، زمانە سازیان پێوە دیارە، هەموو وەکو جاران نەماون، پۆشاکی نوێیان پۆشیووە.

دەباشە، با ناویش وەکو ئەوان سەرقاڵی زمانە سازی بێت، با پلەیەك سەرکەوێ، هەر نەبێ ناوی ئادەمیزاد.

ئادەمیزاد، باشترین و جوانترین خەلقەندەی خوای گەورەیە هەموو ئەم بوونەوەرە لەبەر رێزلێنان لەو دامەزراوە خوای گەورە، بەخۆشەویستترین خەلقەندەی خۆی لەقەڵەمی داوە.

شتێ کە جوانترین خەلقەندەی خوای گەورە بێ، شایانی ئەوەیە ئێمەش ناوێکی شیاوو خۆشی لێ بنێین، بۆیە بەلای منەوە شورەییە ناوێکی ناخۆشی بۆ دیاری بکەین، لەکاتێ کە ئەو هیچ دەسەڵاتی نییە.

ئیدی با چیتر ناوی نامۆ لەمنداڵەکانمان نەنێین،

با واز لەناوی (شەهرام و بەهرام و مامەرو تەمەرو ستی) بێنین.

با نۆرەی ناوی (هێمن و بەختیارو هۆشیارو کامەران و سەربەست)بێ.

ئای کە ناوی (دارەتوو، کەسنەزان و، پیرداودو سێبیران و کێلەسپی) خۆشە.

با بەس بێ (قوشتەپەو قەرەدەرەو قەرەهەنجیر).



# کورتەیەك لە ژیاننامەی خوالێخۆشبوو مامۆستا عەبدولڕەحمان شەمشولەیی

سەلام کەریم سیدان

مامۆستا مەلا عەبدولڕەحمان مەلا شێخ محەممەد مەلا عوسمان شێخانی ناسراو بەمامۆستا مەلا عەبدولڕەحمان شەمشولەیی. لەسالّی ١٩٣١ لەگوندی شەمشولەی سەر بەناحیەی گوێڕی پارێزگای هەولێر چاوی بەدونیا هەڵهێناوە لەبنەماڵەیەکی ئایینخوازو سادەدا ژیاوە، هەر لەتەمەنی ١٠ ساڵییەوە لەلای باوکی خوێندویەتی‌و هەر لەلای ئەویش قورئانی پیرۆزی تەواو کردوە، پاشان وەکو گەڕیدەیەك خولیای ئایین و زانستەکانی بووەو بەرماڵی ئایینی کردۆتە شان و چەندین گوندو جێگا گەڕاوە لەلای چەندین مەلای ناسراوی سەردەمی خۆی فێری زانستەکان بووە لەوانەش مامۆستا مەلا ئەبوبەکری گوێڕی‌و مامۆستا مەلا سەید



عەبدوللا توتمەیی، مامۆستا مەلا سەدیق نۆغەرانی‌و مامۆستا مەلا مەجیدی گراوی، مامۆستا مەلا عەلی بیرەعارەبانی‌و مامۆستا مەلا یەحیا ماجیدی‌و مامۆستا مەلا شەریفی ناسراو بە(هەوای). ئەم زانا پڕ عیلمە تا ئەوکاتەی هۆشی پڕ زانست دەبێ بەخێرایی لەهەموو لاوە دەبێتە جێی متمانەو باوەڕی پێدەکری‌و لەساڵی ١٩٥٥ لەسەر دەستی مامۆستا مەلا شێخ ئەحمەدی بالیسانی خوێندنی تەواو دەکات و بڕوانامەی (الاجازة العلمیة) وەردەگرێ دواتر لەگوندی (شەمامەل) دەبێتە مەلاو لەبەر ئەوەی هەردەم خولیای ئایینی ئیسلامی پیرۆز دەبی‌و بۆیە بەخێرایی قوتابخانەیەکی ئایینی دەکاتەوەو ژمارەیەك فەقێ لەلای دەرس دەخوێنن، لەساڵی ١٩٥٩ خولی مامۆستایان لەشاری موسڵ بەپلەی یەکەم تەواو دەکات و بڕوانامەی مامۆستای پەروەردەیی پێدەدری‌و لەساڵی ١٩٦٠ دادەمەزرێت بەمامۆستا (معلم) لەشاری موسڵ لەگەڵ ئەوەش سلی لەئایینی پیرۆزی ئیسلام نەدەکردەوەو لەسەر داوای خۆی لەدیوانی سەرۆکایەتی ئەوقاف لەبەغداد تاقیکردنەوەیەکی زانستەکانی ئایینی کردو بەپلەی زۆر چاك دەرچوو. مامۆستا لەساڵی ١٩٨٥دا راژەکەی لەپەروەردە گواستەوە بۆ ئەوقاف و وەکو پێش نوێژو وتارخوێن لەمزگەوتی برایان لەهەولێر داندرا.

وێڕای پێش نوێژی‌و وتارخوێنی مامۆستا هەردەم دەرگای حوجرەو ماڵەکەی والا بووە بۆ قوتابیانی ئایینخوازی پەیمانگاو کۆلێژە ئایینییەکان و فەقێ‌و سوخت و هاولاتیانی تر، و لەسەردەمی خۆی لەبلاوکردنەوەو بەخشینی ئایینی پیرۆزی ئیسلام پێشەنگ بووەو جێگەی رەزامەندی گشت لایەك بووە.

خوالێخۆشبوو ئەندامی ئەنجومەنی بالای ئەوقاف بووەو دەورێکی بەرچاوی هەبوو لەخزمەتی وەقف و گێڕانی کاروباری موڵکەکانی سەر بەوەقف و ئەندامی لیژنەی بالای فتوا بوو لەیەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی ـ مەکتەبی

**خوالێخۆشبوو سەرکەوتنی یەکێتی زانایانی زۆر لا گرنگ بوو و پێشنیاری ئالوگۆڕی فتوا و ڕاوبۆچوونە ئایینییەکان بە نوێترین هۆکارەکانی پەیوەندی وەك (ئینتەرنێت و فاکس) دەکرد**

تەنفیزی ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لەدەرکردنی فتوایەکان و موتابەعەی فتواو کاروباری ئایینییەکانی تردا.

لەسەر پێشنیاری جەنابیان لەوەزارەتی ئەوقاف چەند خولێکی بەهێز کردنەوەی ئاستی زانستی وتاربێژەکان کرایەوە، پرۆگرام و پلانی سەرکەوتنی خستبووە ئەستۆی خۆیو هاوەڵەکانی، بەبەردەوامی موتابەعەی کاروباری ئەوقافی دەکردو حەزی دەکرد ئەم دەزگایە هەردەم سەربەرز بێت و هانی دەداین بۆ زێتر ئەنجامدانی چالاکی هەمەجۆری ئایینیو کردنەوەی پێشانگای دەستنووسیو کەلتووری ئیسلامیو بەهیواوە چەند جار لای ئێمە پێشنیاری چاپکردنی قورئانێکی پیرۆزی کردبوو کە مۆرکی حکومەتی هەرێمی کوردستانی پێوە بێت و دابەش بکرێت بەسەر جیهانی ئیسلامی بەمەرجێك دەستنووسەکە تایبەت بێت بەخۆشنووسێکی کوردی دەست ڕەنگین، خوالێخۆشبوو بیرێکی تیژی هەبوو و زۆر بەوردیو بەتام و چێژەوە سەرنجی بەرامبەرەکەی ڕادەکێشا بۆ ڕاڤە کردنی بابەتە ئایینییەکان و مایەی شانازیشە زۆر لەخۆ بردوانە ڕووبەڕووی کەسانێك دەبووەوە خاوەن هەر پلەو پایەك بوایە کە سنووری ببەزاندبایە ژیانی خۆی بەسادەو ساکاری بردە سەرو، پێی وابوو سەرکەوتنی میللەتەکەی لەوەدایە کە پەراوێز و نووسین و ڕوونکردنەوەی زۆری لەسەر پەرتووکە فیقهیەکاندا کە لەکاتی دەرس گوتنەوەدا وەك پرۆگرامێکی ئاسانکاری هەیە کە ئومێدەواریین بەچاپ بگەیەندرێن.

لەرێکەوتی ٢٠٠١/٦/٢٥ کاتژمێر ٨,٣٠ ئێوارەی ڕۆژی دووشەممە دڵە گەورەو پڕ لەباوەڕو ئومێدەکەی لەلێدان کەوت و دواجار ماڵئاوایی لەگشت موسڵمانان و هاوڕێو

**وێڕای پێش نوێژی و وتارخوێنی مامۆستا هەردەم دەرگای حوجرە و ماڵەکەی والا بووە بۆ قوتابیانی ئایینخوازی پەیمانگا و کۆلێژە ئایینییەکان و فەقێو سوخت و هاوولاتیانی تر**

بەرپرسان لەکارەکانیاندا نابێ هەست بەماندوو بوون بکەن و سڵی لەخزمەتی گەل و نیشتمان نەکەن و خوێنی شەهیدانیان لەیاد نەکەن. جەنابیشی یەکێك بوو لەوانەی بێ پسانەوە هەردەم بەدوای چارەسەر کردنی گرفتەکانی هاوولاتیان وێڵ بوو تا بۆی بکرایە ڕەزامەندی ئەوانی دەنواند. خوالێخۆشبوو سەرکەوتنی یەکێتی زانایانی زۆر لا گرنگ بوو و پێشنیاری ئالوگۆڕی فتواو ڕاوبۆچوونە ئایینییەکان بەنوێترین هۆکارەکانی پەیوەندی وەك (ئینتەرنێت و فاکس) دەکرد.

هاوولاتیانی خۆی کردو ئیدی کوچەو ژوورو بانی مزگەوتەکەی خامۆش بوون و مامۆستای بەرز نیگایان بۆ هەڵناهێنێ کە خواستی خۆی بوو، کە دەپاڕایەوە خوایە کەساس و زەلیلم نەکەیت و (محتاج و احتیاجی) مەردو نامەردم نەکەیت، خوای پەروەردگاریش نزاکەی قبوڵ کرد.

هەزار سلاو لەگیانی پاکی مامۆستای پایە بەرزو لەخۆبردووی گەلەکەمان، لەخوای گەورەش نزا خوازین بەبەهەشتی بەرینی خۆی شاد بکات.



# توێژینەوە لەسەر فیقهی ئیسلامی

## هۆکارەکانی جیاوازی بۆچوونی زانایان لەفیقهی ئیسلامیدا

ئەڵقەی یازدەهەم

مەلا عبداللطيف بامۆکی

١-جمهوری زانایانی فیقەو ئوسول دەڵێن: نەهی راستییە لەقەدەغەو حەرامداو لادراوە لەماناکانی دیکەی‌و بەڵگەشیان قورئانە: ﴿وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا/ سورة الحشر-٧﴾، خودا فەرمان دەدا ئەوەی نەهی لێکردوە نابێ بکرێ. بێگومان لەپێشەوە باسکراوە کە فەرمان بۆ پێویست و ئەرکە، ئەگەر وازهێنان لەقەدەغەکراو واجب بێت جگە لەمانای حەرام چی دەبەخشێ.

٢-گوتراوە راستییە لە (باش نییە) واتە کەراهە چونکە نەهی مانای ئەوەیە ئەو کارە باش نییە ئیتر مەرج نییە حەرام بێت و قەدەغە بێت، بەڵام ئەم بۆچوونە رەت کراوەتەوە لەبەر ئەوە کەوتراوە (نە) مانای قەدەغە دەگەیەنێ.

٣-هەندێك دەڵێن هاوبەشە لەنێوان حەرام و باش نییەدا.

٤-حەنەفیەکان دەڵێن ئەگەر بەڵگەکە قەتعی بوو ئەوا بۆ حەرامەو ئەگەر زەنی بوو ئەوا کەراهەیە.

### نەهی بۆ کوتوپڕ و هەمیشەیە.

خۆی نەهی بۆ داوا کردنی نەکردنی هەر کارێکە گەرماو گەرم وبەشێوەی هەمیشەیی، چونکە پاش فەرمانەکە کۆتایی هێنانە پێویستە بەوگوێ پێدان و فەرمان بەرداری لەبەر ئەوەیە جیاوازی هەیە لەنێوان فەرمان و نەهیدا، چونکە فەرمان بۆ فەوری نییەو مەرج نییە هەمیشە بێت، نهێنییەکەش لەوەدایە خودا فەرمان نادات بەسەر مرۆڤدا هەتا بەرژەوەندی گشتی یان تایبەتی تێدا نەبێ ئەوەش بەیەکجار دێتە ئەنجام، بەڵام نەهی لەبەر زیان و خراپەی گشتی یان تایبەتییەو ئەوەش تەنها بە دوورکەوتنەوەی کوتوپڕو هەمیشەیی دێتە دی، چونکە ئەگەر ساڵانێك کارێك کە قەدەغەیە نەتکردبوو یەکجار کردت ئەوە فەرمانەکەت جێبەجێ نەکردووە، لەبەر ئەوە فەوری و هەمیشەیی بەشێکە لەمانای گوێڕایەڵی.

نەهی دەخوازی بۆ بەتاڵی‌و فەساد: زانایانی ئوسول و شەرع لەهەموو رێبازەکان لەم رێسا زۆر



مەترسی‌و فرە ئەنجام کاریگەرە جیاوازیان زۆرەو بـوون بەسـیّ تـەوەرەوە هـەرگیز نـەهی مانـای فەسادی نییـە، نـەهی مانـای فەسـادە بەشـێوەی رەها، جیاکردنەوە و درێژە پێدان

یەکـەم: نـەهی بـۆ فەسـاد نییـە، ئەوانـەی ئـەم رێگەیان هەڵبژاردووە ئەم بەڵگانەیان هەیە!

أ. ئەگەر نەهی بـۆ فەسـاد بێـت دەبـیّ کارەکـە دروست نـەبیّ، بەڵام نـەهی هەیـەو کـار دروسـتە وەك نوێژ لەزەوی داگیرکراو، دەست نوێژ بەئاوی زەوت کراو، حەج بەپارەی حەرام.

ب. ئەگەر نەهی بۆ فەساد بێت دەبیّ هەر کات نەهی هەبوو فەسادیش هەبێت خۆ ئەوەش وانییە وەك نمونەکانی سەرەوە.

ت. نەهی مانای ئەوەیە کـە کارەکـە دروسـتە، بەڵام لەبەر هـەندیّ خراپـەی گشتی یـان تایبـەتی دروست نییە، چونکە ئەگەر کارەکە نەبیّ نەهی لیّ ناکریّ وەك نەهی لەرۆیشتنی شلەپەتەو تەماشا کردن لـەکوێر، بێگومـان ئـەم بەڵگەیـە بەرپـەرچی هەیە کە مەبەسـت لەدروسـت کامەیـە؟ شـەرعی، ئاسایی، عەقلی بەڵام مەبەست دروستی شەرعییە ئـەوەش پێویسـتی بەدروسـتی نییـە، هەرچـەندە ئـەم راو بۆچوونـە دراوەتـە پـاڵ پێشـەوا ئـەبو حەنیفـە، بـەڵام زانـای ئوسـوڵ دکتـۆر مسـتەفا زەڵمی بەلایـەوە راسـت نییـە لەبـەر ئـەوە ئـەبو حەنیفـە لـەنێوان راسـت و بـاتڵ فاسـدیان قـەرار داوە، کەواتە راست نییە نەهی بو فەساد بێت.

دووەم: نەهی بۆ فەسادە:

ئەم بۆچوونە پێچەوانەی رای یەکەمە، چونکە نەهی بۆ فەسادی نەهی لێکراوە کە بەعیبارە بێت یـان مامەڵـە ئـەم بۆچوونـە زیـاتر بـۆ حەنبـەلی‌و زاهیریـەکان دەگێڕنـەوە لەگـەڵ زەیدیـەکان، هەرچـەندە بەڵگـەکانیان جیـاوازە وەك ئـەوەی خـوارەوە، حەنبـەلی دەڵێـن: نـەهی بـۆ فەسـادە. ئەگەر فەریزە نەبوو لەبەر ئەم هۆیانە:

أ. دەقی فەرمـوودە هەیـە (من عمل عملاً ليس عليه امرنا فهو رد).

ب. ئیجمـاعی بێدەنگـی کـە زۆربـەی زانایـان گوتوویانـە هـەر گرێبـەندێك کـە نـەهی لیّ کرابێـت فاسدە.

زاهیریـەکان دەڵێـن بـەپێی بەلگـەکانی حەمبەلیەکان زەیدیەکان هەموو نەهی بۆ فەسـادە ئەگەر بەڵگەی لادانی نـەبوو بەهـەمان بەلگـەکانی زاهیری‌و حەمبەلی.

سێیەم: میانەی هەردوو بۆچوونی پێشوو:

ئـەم بۆچوونـە میانەیـە لـەنێوان ئـەوەی دەڵێـن نەهی بۆ فەسادەو ئەوەی دیکە دەڵیّ بۆ فەساد نییە. بەرەها ئەم بۆچوونە جیاوازانـە هـەندیّ مەسـەلەی فیقهی جیاوازی دروستکردووە، بۆ نمونە:

مـارە بـڕی ژن بـەژن بـەو مانایـە، کـە مـارەیی یەکـەم ژنـی دووەم بێـت و بەپێچەوانـەوە، مـارەبڕینی داواکـردن لەسـەر داواکـردن، واتـە خوازبێنی لەسەر خوازبێنی مارەبڕینی ژنی تەڵاق کەوتوو لەپیاوێکی کە بەنیازی حەڵاڵی کردن بۆ مێردە پێشووەکە، مامەڵە لەسەر مامەڵەو کڕین و فرۆشـتن لـەکاتی بـانگی هـەینی، نوێـژ لـەزەوی زەوت کـراودا یـان لـەکاتی بێجێگـەو شـوێنی نـاجۆر. ئێسـتە بـەدرێژی باسـی ئـەم جیاوازیانـە دەکەین، چونکە پەیوەندی فیقهی ئیسلامی زیاتر بەئوسوڵەوەیە.

## یەکەم: لەبارەی مارە بڕینەوە:

١-ژن بە ژن:

واتـە گۆڕینـەوەی ژنێك بـەژنێکی کە بەدەقێکی روون (لاشغار في الاسلام) هاتووەو هەموو زانایـان لەسـەر ئـەوە کۆکـن کـە (شـغار) حەرامـەو نـابیّ



بکرێ، بەڵام ئەگەر روویدا لەسەر بنەمای پێشوو کە نەهی بۆ فەسادە یان بۆ فەساد نییە جیاوازی زۆر هەیە.

أ. ئەبو حەنیفەو یارانی دەفەرموون مارە برینەوە دروستەو هەر یەکەیان لەدوو ژنەکە مارەی هاوچەشنی هەیە (مهر مثل) چونکە ئەوان دەڵێن ئەگەر نەهی لەبەر خودی گرێبەندیەکە نەبوو بەڵکو لەبەر وەسفێك بوو ئەوا دروستە بەئەسڵ، بەڵام بەوەسف بەتاڵە، خۆ پێویست نییە ئەگەر وەسف بەتاڵبوو ئەسڵ بەتاڵبێت، لێرەدا فەسادی مارەییەکە لەبەر نەبوونی مارەییە، خودی عەقیدەکە دروستەو مارەیی هاوچەشنی دەکەوێت، چونکە لەغەیری ئەم مەسەلەیەدا ئەگەر مارە برین هەبوو بێ نەقدو مارەیی مارەی هاوچەشنی دەکەوێ.

ب. زاهیریو حەنبەلی دەڵێن ئەم جۆرە مارە برینە بەتاڵە، چونکە لای ئەمانە نەهی بۆ فەسادە.

ج. مالیکییەکان دەڵێن مارە برینەکە بەتاڵە بەڵام جیابوونەوەکە دەبێ بەتەلاق بێت و لای دادوەر بێت دەڵێن هەر گرێبەندیەك کە فاسد بێت و جیاوازی راو بۆچوونی لەسەر بێت ئەگەر قازی فەرمانیدا بەدروستی ئەوە دروستە، کەواتە ئەگەر قازی حەنەفی فەرمانیدا بەراستی مارەیی ژن بەژن ئەوە دروستە.

د. شافعییەکان دەڵێن: مارە برینی ژن بەژن فاسدو بەتاڵە ئەگەر نەخت و مارەیی تێدا نەبوو، بەڵام ئەگەر هەبوو نیکاحەکە دروستەو مارەییەکە بەتاڵەو مارەیی هاوچەشنی بۆ هەردوو ژن هەیە.

٢-مارە بەجاش یان (محلل):

وەکو روون و ئاشکرایە پاش تەلاقی سێیەم پەیوەندی ژن و مێرد دەپچرێو دووبارە نابێتەوە بەگرێبەندی تازە هەتا ژنەکە شوو نەکات بەپیاوێکی تر بەشێوەی سروشتیو ئاساییو کاری ژن و مێردی روویدات و لەیەك جیا ببنەوەو عیدەی تەواو بێت ئەو کاتە بەگرێبەندێکی تازە دروستە بۆ مێردی یەکەم، چونکە دەقی قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ/ سورة البقرة/ ٢٣٠﴾ بەڵام حیلە شەرعییەك پەیدابووەو رەگی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی نەفامیو بێوێلی پێش ئیسلام کە مارە برینێکی کاتی ژن لەپیاوێکی دیکە بەمەرجێ پاش ئەنجامدانی کاری تەلاقی بداتەوە بۆ مێردی پێشی هەر لەبەر ئەوەیە زاراوەی (تیس المستعار)یان بۆ داناوە یان مارەبەجاشی کە بەراستی لە زۆر لایەنەوە بەتاڵە. یەکەم: مارەبرینی کاتییە وەك سیغەو موتعە. دووەم: مەرجی تەلاقدانی تێدایە کە مەرج لەمارەبریندا نییە. سێیەم: جۆرێکە لە دەقی ئاشکرای لەسەرە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ: {لعن الله المحلل والمحلل له} نيل الاوطار ج ٦-١٥٧.

بەڵام زانایان جیاوازیان لەسەر دروستیو نا دروستی هەیە لەبەر ئەوە جیاوازن لەبارەی ئەوە کە نەهی بۆ فەسادە یان نە.

أ. ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: نیکاحەکە دروستە، چونکە ئەوان دەفەرمون شەرتی ناردوست گرێبەندی نا دروست ناکات.

ب. ئیمام مالیك و ئیمام ئەحمەد دەفەرموون بەتاڵەو دروست نییە.

ج. شافیعی و یارانی دەفەرموون پێویستە روون بکرێتەوە ئەگەر مەرجەکە لەکاتی گرێبەندەکەدا بوو ئەوە نیکاحەکە بەتاڵە، بەڵام ئەگەر باسی نەکرابوو هەرچەند نیازیشی بووبێت ئەوە گرێبەندەکە دروستە، بەڵام وەك بۆچوونی شەرعیو فام و عەقل و مەبەست لەنیکاح کردن



که هەمیشەیی‌و بۆ تەمەنە راست وایە ئەم جۆرە نیکاحە بەتاڵ بێت، چونکە رەوشتێکی جاهیلی‌و نەفامیە پێچەوانەی دەقی قورئانەو مارەبڕینێکی کاتی‌و بۆ مەبەستی حەلاڵ کردن و بەکارهێنانی مارەبڕین بۆ مەبەستێکی نا شەرعی.

**دووەم: لەبارەی تەلاقەوە:**

لەبارەی تەلاقدان لەعوزری شەرعیدا یان لەکاتی منداڵبووندا یان لەو کاتەی کە ئافرەت ئاساییە ئایا تەلاق دەکەوێ یان نە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە نەهەییە کە تەلاق لەغەیری کاتی عیدە کە ئایەتی: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ/ سورة الطلاق-١﴾ لەسەر قاعیدەی ئەمر بەکارێك نەهییە لەدژەکەی کە فەرماندراوە تەلاق لەو کاتانە بێت کە عیدەی بۆ حیساب دەکرێ. نەهییە لەو کاتانەی کە بەعیدە ناژمێردرێ، چونکە تەلاق لەوکاتانەدا نییە کە ژن پاك بێت و پیاو نزیکی نەکەوتبێ، لەبەر ئەوە کاتی عیدە درێژ نەبێ‌و ژن تووشی ئازار نەبێ ئەوکاتە ئەگەر تەلاق لەعادەو هاونمونەکانیدابوو لای زاهیری‌و زەیدی‌و جەعفەری ناکەوێ، چونکە نەهی بۆ فەسادە ئەو جۆرە تەلاقانە بەتەلاق ناژمێردرێ کە لەعادەدا بێ، بەلام حەنەفیەکان و شافیعیەکان دەڵێن تەلاق دەکەوێ، چونکە نەهی لەکاتێك لەبەر وەسفێك نابێت هۆی فەسادو لای مالیکی پیاو دەبێ دووبارە رای کێشی بۆ ژێر نیکاحی خۆی‌و کە پاك بۆوە ئەوکاتە تەلاقی بدات ئەگەر پیاوەکە ژنەکەی نەگەڕاندەوە دادوەر بۆی هەیە بەزۆر ئەو کارەی پێبکات و فەرمانی دادوەر لەبریتی نیازو گفتی پیاوەکە لەم بارەیەوە کێشەیەکی زۆر ئاڵۆز هەیە لەبارەی مەسەلەیەکی فیقهی کە خۆ

رزگارکردنی ئافرەتە لەبەندی مارەیی‌و نیکاحی پیاو، بەلام پیاو بیانوو بگرێ بۆ زیادە زیان لەئافرەت یان مامەڵەی خراپ کە لەگەڵیدا بۆ وەرگرتنی تەلاق و دەستهەڵگرتن لەمافی مارەیی‌و زیادە قورسی لەسەر ئافرەت کە بەزاراوەی فیقهی پێی دەڵێن (خلع)ی هاوتا لەگەڵ زیان پێگەیاندن ئەم مەسەلەیە هەموو زانایان دەفەرموون گوناهەو پیاو ئەگەر کردی تووشی سزای خوا دەبێ، بەلام بیروڕایان جیاوازە لەسەر کەوتنی تەلاقەکەی یان نەکەوتنی لەسەر هەمان جیاوازی لەمەسەلەی نەهی بۆ فەسادە یان نە.لێرەدا بەپێویستی نەزانم ئاماژە بەهەڵبژاردنی رایەکی تایبەت لەم رایانە بکەم.

بێگومان کۆڵەکەی (خلع) رازی بوونی هەردوولایە بۆ جیابوونەوەو کۆتایی هێنان بەپەیوەندی ژن و مێرد ئەگەر ئەم خولعە هاوکات بوو بەکارێك دژی مەبەست وەك بیانوو، زۆرداری ستەم ئەو کارە نادروستە لێرەدا دەبێ دادوەر بزانێ ئافرەت کە سەرانە دەدا بۆ رزگار بوونی خۆی‌و سەندنەوەی ئازادی‌و سەربەستی‌و لەبەر ستەم و زۆری مێردەکە بێت یان ئافرەت هەر حاشا دەکات جیاوازی هەیەو دەتوانی بۆ پەیرەوی لەدادوەری بەپێی یاسای شەرع فەرمان بدات و کام راو بۆچوون خزمەتی دادپەروەری دەکات پەسەندی بکات بەمەرجێك تێکەلاوی دوو رێبازی دژ بەیەك نەبێت

ئەم باسە زۆری بەدەمەوەیەو پێویستی بە بەراوردکاری‌و توێژینەوەی زیاتر هەیەو پێویستە دادوەرو قازی‌و موفتی زۆر ئاگاداری بۆچوونەکان بن و هوشیار بن سەنگەر تێکەلاو نەبن، چونکە گلەیی‌و گازاندە لەفیقهی ئیسلامی دەکرێ ئەگەر ستەم بۆ هەر لایەك ژن یان پیاو هەبوو.



# کامیان اللهم صل (علی محمد) یان باشتره: اللهم صل (علی سیدنا محمد)؟

به پێنووسی: عومەر ڕیشاوی

لەسەردانێکمدا بۆ یەکێك لەمزگەوتەکانی شاری هەولێر، بۆ مەبەستی نوێژی هەینی، گوێم لەوتارخوێنی هەینی بوو، بەتوندی هێرشی هێنایە سەر ئەو کەسەی، لەسەلاواتدانیدا دەڵێ: (اللهم صل علی محمد) وا دیاربوو هەموو سەلاواتدانێکی لەو وێنەیە، بەسەلاواتدانی دروست دانەدەنا.. لەگەڵ ڕێزمدا بۆ وتارخوێنی بەڕێزو، لەگەڵ ئەوەدا گەلێ لەلایەنی وتارەکەییم بەدڵ بوو، جێگای سەرەنجی نوێژکەران و ئامادەبووانیش بوو، بەڵام -بەندە بەش بەحاڵی خۆم- ئەو هێرش هێنانەم بەو توندیو تیژییە بەڕاست نەدەزانیو پێم خۆش نەبوو.. بۆیە بەباشم زانی ئەم وتارە بەم شێوەیەی خوارەوە بۆ (خۆری ئیسلام) بنێرم و لەم بارەوە هەندێك بدوێین، با سەردانێکی (مغنی المحتاج ج١ لاپەرە ١٧٦) بکەین، کە دەفەرموێ: (قال في المهمات: واشتهر زيادة (سيدنا) قبل محمد، وفي كونها افضل نظر وفي حفظي ان الشيخ عزالدين بناه على ان الافضل سلوك الادب ام امتثال الامر؟ فعلى الاول يستحب دون الثاني. اه وظاهر كلامهم اعتماد الثاني..

ئەمەی سەرەوە دەستەواژەیەکە، بەڵکو بڕگەیەکی جوان و پیرۆز و بابەتیانەیە لەلاپەڕەیەکی (مغني المحتاج) کە یەکێکە لەو کتێبانەی هەمیشە جێی متمانەی هەموو (فقهاء) و مامۆستاو مەلایانی- بەلانی کەمەوە- کوردستانی ئێمەیە.. فەرموو ببینە کە چەند جوان و بابەتیانە لەوە دەکۆڵێتەوە کە گوایە، ئێمە لە سەلاواتدانماندا لەسەر حەزرەتی محەمەد(د.خ)، لەنوێژ یان لە دەرەوەی نوێژ، کام لەم دوانە باشترە بیڵێین؟:

١. اللهم صل علی محمد. . . ٢. اللهم صل على سيدنا محمد. . .

پێشەکی ئەوەتە دەبینی هیچکامیان پێکەوە ناداتە دواوە و بفەرموێ: ئەوەیان دروست نییە، بەڵکو باسەکە دەخاتە ناو بازنەی (کامیان لەویان باشترە؟) و دەفەرموێ: لە کتێبی (المهمات)دا، خاوەنی (المهمات) فەرمویەتی: لە نێوان جەماوەری خەڵقدا بووەتە باو لەپێش وشەی (محەمەد) (صل الله عليه وسلم) وشەی (سیدنا) زیاد دەکەن.. جا لەسەری دەڕوات و دەڵێ جێی رامان وتێڕوانینە، کە ئەمەیان باشتربێ لە (على محمد).

هەروەها خاوەنی (المهمات) درێژە بە لێکۆڵینەوەکەی دەدات و دەفەرموێ: (وفي حفظي ان الشيخ عزالدين بناه على ان الافضل سلوك الادب ام امتثال الامر؟

واتە من لە یادمدایە، کە شێخ عزەدین ئەمەی بنیادناوە لەسەر ئەوە کە ئاخۆ چاکتر ئەوەیە رێگای رێز لێنان لە گفتوگۆدا بگرینەبەر، یان پەیڕەوی دەقی فەرمودەکە: رێك و راست، وەك خۆی بکەین کە دەفەرموێ: پرسیاریان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد: (قد عرفنا كيف نسلم عليك؟ فكيف نصلي عليك؟ فقال: قولوا: اللهم صل على محمد وآلآ محمد.. متفق عليه) (وفي رواية كيف نصلي عليك، اذا نحن صلينا عليك



في صلاتنا؟ فقال: قولوا..الخ راوه الدار قطني وابن حبان في صحيحه، والحاكم في مستدركه، وقال: انه على شرط مسلم. مغني المحتاج ج١ ص١٧٤)

دیاره له هەردوو گێڕانەوەی فەرموودەکەدا فەرمویەتی: ئێوە بڵێن: (اللهم صل علی محمد) بەبێ زیاد کردنی وشەی (سیدنا) . جا ئێستە ئێمە لەجێبەجێکردنی ئەم فەرموودەیەدا دوو ڕێمان لەبەر دەمدایە، کە لای (فقهاء) بەڕێزەکانمان بووەتە جێی لێکۆڵینەوە، کامیان لەویان باشترە؟ ئاخر خۆ هەموویان هاودەنگن لەوەدا کە هەر دووانیان دروستن و بەسەڵاواتدان دادەنرێن، بێگومان و بیڕای جیاواز ئەوان واتە زانایانی (فقە) لەوەیان کۆڵیوەتەوە- وەك وتمان کامیان باشترە لە وەڵامدا دەڵێن: ئایا لە کاتی سەڵاواتدانەکەدا ڕێی ڕێزلێنان و ئەدەب لەبەر چاو بگرین، یان ڕێی ڕێك و ڕاست پەیڕەو کردنی وتەکەی پێغەمبەر(د.خ) کە چۆن هاتووە، کە دەفەرموێ: (قولوا اللهم صل علی محمد) کە هەردوو ڕێگاکە پەیڕەوکردنی ڕێگای شەرعە، کە کەمترین ناشەرعی لە هیچکامیاندا نییە؟ دەی ئەگەر ڕێگای یەکەم بگرین، ئەوا بۆ گرتنی ڕێگاکە (اللهم صل علی سیدنا محمد) باشترە لە (اللهم صل علی محمد)، ئەگەر ڕێگای دووەمیش لەبەر چاو بگرین،هەم دیسان بۆ گرتنی ڕێگاکە (اللهم صل علی محمد) باشترە لە (اللهم صل علی سیدنا محمد).

هاوکات لەگەڵ تێبینی ئەوەدا، کە لەدوای لێکۆڵینەوەکەی (المهمات) ئەوەبوو خاوەنی (مغنی المحتاج) فەرمووی: (وظاهروا کلامهم إعتماد الثاني). واتە: وا بەدیار دەکەوێ، زانایانی (فقە) پشتیان بە دووەم بەستووە، واتە بۆچوونی دووەم کە پەیڕەوکردنی ڕێك و ڕاستی دەقی فەرمانەکەیە، وەك خۆی، کە دەکاتە (اللهم صل علی محمد) باشترە.

جا ئەگەر مەسەلەیەك ئەوەندە خلافی فەرعی بێت جائزو ڕەوایە هەرگیز لەسەری بەشەر بێین؟! یان جوانترو ڕەواتر ئەوەیە لێکۆڵینەوەو گفتوگۆی زانستیو زانایانەی وەك ئەوەی مغنی المحتاج ی لەسەر بکەین..؟ چونکە ئەوەندە ناهێنێ لەلایەك و، خۆشەویستمان حەزرەتی پێغەمبەری سەروەریشمان (صلی الله علیه وسلم) وای پێخۆشە، ڕێز لەیەکتر بگرین و ڕاو بۆچوونی یەکتر بەحورمەتەوە سەیر بکەین و لەحەلال و حەرام کردندا بە(دیقەت) بین، (باشتر)و (دروستە) لەیەکتر جیابکەینەوە، چونکە تەنانەت ئەو مەسەلەیە، کە ئێستا باسمان لێوە کرد لەلای زانایان لە(باشتر) بوونیدا خلاف هەیە..

ئەمەیش بەقەدەر مسقالە زەرەیەك لەسەروەریو سەرداری ئەم خۆشەویستە کەم ناکا . بەڵێ. ئەو لەپلەی باڵای خۆیدایە (رحمة للعالمین وسید المرسلین)ە لەلایەن خوای (رب العالمین)ەوە نەك (سید المرسلین)، بەڵکو (سید الکونین والثقیلین) بەخەڵات پێ بەخشراوە.. وەك شێخی (بوصیری) ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| محمد سيد الكونين والثقيلين | والفريقين من عربٍ ومـن عجم |
| محمد اشرف الاعراب والعجم | محمد خير من يمشي على قدم |

ئیتر با هەردەم بەلێکۆڵینەوەی زانستیو دڵسۆزانەو بابەتیانە لە گشت بوارەکانی باس و لێکۆڵینەوەدا پشت ئەستوور بین.



# یەکبوونی ئایینی ئیسلام و شارستانییە جیاوازەکان لە جیهانی ئیسلامدا

مافپەروەر: هەڵکەوت جەمیل

خوای گەورە ماڵی پیرۆزی بەو جۆرە وەسف کردووە: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ* فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ/ سورة آل عمران/٩٦-٩٧﴾.

یەکەمین نوسراوی قورئانیش کە بۆ پێغەمبەر(د.خ) بە سروش هاتە خوارەوە ئەو فەرموودە پیرۆزەی بوو کە دەڵێ: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ* خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ* اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ* الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ* عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ/ سورة العلق ١-٥﴾.

هەروەها بەو بنەما ئایینیانەی وەکو حەج کردن، قورئان، ئیمان هێنان و بەکارهێنانی شەریعەت و عەقیدەی ئیسلامی، دیارترین و زۆر ترین یەکەی موسڵمانیەتی ئیسلام دەرکەوتن و لەو باسەشدا بەراشکاوی باسی هەندێکیان دەکەم:-

قورئانی پیرۆز ئەو تەنها کتێبەیە کە موسڵمانان وەکو بڕوایەکی خودی دەیخوێننەوەو لەبەری دەکەن، خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ/ سورة الحجر- ٩﴾ ئەو کتێبە پیرۆزە وەکو بەڵگەنامەیەك هاتە خوارەوەو یاوەرانی پێغەمبەریش بەپێی توانا نوسیانەوەو کاریان پێکرد.. قورئانی پیرۆز بۆ ئێمەی موسڵمانان کتێبی ژیانمانەو ئەو فەرمانە خواییەش کە دەڵێ (اقرا) هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوەو بوونی مرۆڤەوە دەستی پێکردوە خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ* مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ/ سورة الروم-٣٠-٣١﴾. (فطرة) بەمانای ئەو سیفەتە دێت کە لەسەرەتای دروست بوونی کەسەکەوە دەبیندرێت. سیفەتی سروشتی مرۆڤەکە. ئایین. سوننەت.

قورئان عەقیدەو رەوشت و شەریعەت و گێڕانەوەی رووداوەکانە: عەقیدە ئەو یەکبوون و ئیمانەیە کە خوای گەورە لەکتێبەکەیدا ناردویەتی، شەریعەتیش باوترین و شیاوترین ئەو رەوشتانەیە کە گۆڕانیان بەسەردادێ -وەکو رێسا رامیاریو ئابوورییەکان لەلایەکیش ئەو رەوشتانەیە کە بەچڕیو تەواوی دەمێننەوەو دەستکاری ناکرێن وەکو پەرستنەکان. رەوشتیش



> پێویستە زانایان لە دیاردە جیاوازەکانی سروشت بکۆڵنەوە بۆ هەر دیاردەیەک زانست و بەرنامەی تایبەت دابنێن بەمەرجێک (هەردەم پەروەردگار و دانەری مەزنیان لەبەر چاو بێت و چاکەکە بۆ ئەو بگەڕێننەوە)

مەبەستی ئاستی هەڵسوکەوت دێت، کە پێغەمبەرمان(د.خ) لەژیانیدا ئەنجامی داون هەڵسوکەوتەکانی خۆی بۆ باسکردووین. **﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ/ سورة القلم-٤﴾**، لایەنی گێڕانەوەی چیرۆك و ڕووداوەکانیش خوای گەورە دەفەرموێ: **﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لأُولِي الأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ/ سورة يوسف-١١١﴾**. بەو جۆرە قورئانی پیرۆز بانگەوازی یەکبوونیو یەکێتی ئاینی کردووە، بانگەوازی کاری چاکەو ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییە، خەڵك هەموو بەندەی خوان و لەیەك گیانەوە دەرچوون هەروەکو خوا دەفەرموێ: **﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ/ سورة النساء-١﴾** نوێژکردن دەربڕین و هێمایەکە بۆ یەکبوونی ئیسلامی کە ڕۆژانە ئەوانەی لێوە ئەنجام دەدرێ: پێنج فەرزەکە، خۆ ئامادەکردن بۆ فەرزەکان، چۆنیەتی ئەنجامدانیان، پاداشتی بەکۆمەڵ کردنی نوێژەکان (الصلاة الجماعي).

هەروەها زەکات گرێبەندێکی ئابوورییە لەلایەن دەوڵەمەندو هەژاران، ڕۆژووگرتن هاوسەنگیو یەکسانییە بۆ هەموو کەسێك کە بتوانن ئەو پەرستنە بکەن جا لەهەر وڵات و شوێنێکدابن.

## لەنێوان یەکبوونی ئیسلامیو لایەنە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ

لەسەرەتاوە کە ئیسلام هات ئامـاژەی بۆ دیاردە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤایەتیو سروشت کرد، لەگەڵ یەکبونی ژیانی مرۆڤایەتی،خوای گەورە دەفەرموێ: **﴿وَالأَرْضَ وَضَعَهَا لِلأَنَامِ* فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الأَكْمَامِ* وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ وَالرَّيْحَانُ/ سورة الرحمن ١٠-١٢﴾** ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەو سورەتە پیرۆزە دەبینین پەروەردگار چەندین وەسفی بۆنەم گێتییە کردووە، ئاسمان و زەوی، وشکانیو ئاو، دونیاو کۆتاییو کارو ژیان کەهەموو ئەوانە بانگەوازێکن بۆ درێژبوونەوەی ژیان.

لەگێتیدا جیاوازی زۆرهەن هەروەکو پەروەردگار دەفەرموێ: **﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنْ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ* وَمِنْ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ/**



سورة فاطر/٢٧-٢٨﴾ ئەو دوو ئایەتە پیرۆزەی سەرەوە ئاماژە بەزاناو زانستەكانی سروشتیو ئاسمان و رووەك و زەوی ناسیو ئاژەڵناسی دەكات، دەبینین سێ جار وشەی (مختلف) هاتووەو وشەی (العلماء)یش جارێك هاتووە، ئەو دوو ئایەتە راڤەی ئەوە دەكەن كە پێویستە زانایان لەدیاردە جیاوازەكانی سروشت بكۆڵنەوە بۆ هەر دیاردەیەك زانست و بەرنامەی تایبەت دابنێن بەمەرجێك (هەردەم پەروەرگارو دانەری مەزنیان لەبەر چاو بێو چاكەكە بۆ ئەو بگەڕێننەوە).

## لەشارستانیەتی ئیسلامی بۆ بەجیهانیكردنی ئیسلام:

زۆر بەساكاری دەڵێم سەرەتا ئیسلام لەمەككەوە سەری هەڵدا بۆ مەدینە گوێزرایەوە. پێغەمبەری مەزن(د.خ) لەیەكەم رۆژی سروشی قورئانیەوە تادوا چركەكانی ژیانی سڵی نەكردووە لەبڵاوكردنەوەو دەوڵەمەند كردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیو تا ئەوكاتەی ناوچەكانی دەوروبەری بەئیسلامكردو دوای مردنیشی خەلیفەكان هاتن و درێژەیان بەرێبازە پیرۆزەكەی سەروەرماندا.

بەو جۆرە رووبەری ئیسلامی فراوان بوو تاگەیشتە فارس و رۆمەكان و لەوێوەش لەهەموو لایەك موسڵمان و ئایینی ئیسلام بڵاوەی كردو ئێستاش هەر لەبرەودایەو كەسانی ماندوو بۆ ئیسلام و پەیامەكەی هەردەم لەهەوڵی ئەوەدان كەسانی ناموسڵمان بهێننە ژێر ئاڵای ئیسلام، بەو جۆرەش هەندێ كەس ئیسلامیان بە ئایین وەرگرت و هەندێكیش بۆ ئەوە چوون ئیسلام هێزێكی داگیركەرەو تەنگیان پێ هەڵدەچنێ ئیدی لەلایەن زۆر میللەت و لەزۆر وڵاتیش دەمارگیری نەتەوەییو رەچەڵەكی دروست بوو تا گەیشتە دەمارگیری مەزهەبیش و چەند گروپێكی ئیسلامی دروست بوون كە هەریەكە ئامانجی بەكارهێنانی چەكبوو بەمەبەستی بڵاوكردنەوەی بیرو باوەڕە ئایینخوازییەكەی، ئەوەش ترسناكترین جۆری گروپە ئایینیەكانە ترسناكییەكە لەوەدایەو كە كاری دەگۆڕێن بۆ ململانێی رامیاریو سەربازی هۆشەكی.. دیارترین و زەرەرمەندترین نمونەی سەردەمیش لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەمیسرو جەزائیرو چەند وڵاتێكی تر لەئارادایە، هەروەكو ئەو ململانێ ئایینیو مەزهەبییە لەوڵاتانی رۆژئاواش لەئارادایە.

## شارستانیەتی ئیسلامی لەبەردەم رۆژئاوادا

ئەو هۆكارانەی كە لەجیهانی ئیسلامیدا ناكۆكی ئایین دەنێنەوە:-

یەكەم: پاشماوە شارستانییە كۆنەكانی ئیسلامی لەو وڵاتانەی كە ئیسلامیان تێدا بڵاو بۆتەوە لەوڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر جیاوازە.

دووەم: هۆكارە ئیسلامییەكان بەرنچكەو مەزهەبە جیاوازەكانییەوە.

سێیەم: شارستانێتی رۆژئاوا،

> زەكات گرینبەندێكی ئابوورییە لەلایەن دەولەمەند و هەژاران، رۆژووگرتن هاوسەنگی و یەكسانییە بۆ هەموو كەسێك كە بتوانن ئەو پەرستنە بكەن جا لەهەر وڵات و شوێنێكدابن



کە لەسەدەی شازدەهەمەوە جیهانی ئیسلامی گرتەوەو، توانی جیهانی ئیسلامی لە زۆر بواردا بێبەش بکات و شارستانییە مرۆڤایەتییەکان بکا بەشارستانییەکی ئەوروپیی‌و وای لێهات چەند قوتابخانەیەکی ئابووری سەربەست و سەرمایەداری‌و ئیشتراکی‌و شیوعیەتی بڵاوببێتەوە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ڕێچکە ئایینییە جیاوازەکانیان و کردنەوەی کڵێسە لەوڵاتە ئیسلامییەکان و بڵاوکردنەوەی ڕێسا کارگێڕی‌و رامیاری‌و ئابوورییەکان و بەو جۆرەش جیهانی ئیسلامی خۆی لەبەردەم چەند هەڵوێستێکی جیاواز دەبینێتەوە کە پڕە لەململانێ‌و ناکۆکی.

ئەو سێ شارستانییە پێویستە بۆ خزمەتکردنی یەکبوونی ئایین و ئیسلام پەیڕەو بکرێ‌و لەگەڵ ئەوەش هەر وڵاتێکی ئیسلامی تایبەتمەندێتی شارستانی‌و پاشماوە کۆنەکان بپارێزێ‌و هاوسەنگییەك دروست بکات لەگەڵ جیهانی سەردەمدا.

## بانگەوازێك بۆ ماڵی خوا

خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا/ سورة ال عمران-٩٧﴾ ئەوە راستییەکەو گفتوگۆو دەمەتەقێی پێ ناوێت، چونکە شوێنێکی وا زۆر بەرزترە لەهەموو دەمەتەقێیەك ئیدی هیچ لایەنێکی ئیسلامی ناتوانێ بەئارەزووی خۆی ئەو ئایەتە داڕێژێ یان شی بکاتەوە.

بەو جۆرە هەموو بنچینەو ڕێساکانی ئایینی ئیسلامی تەنیایەو موڵکی هەموو خەڵکە چ موسڵمان چ ئەوانی تر.. پەیڕەوکردنی ئەو ڕێسایەش هەنگاوێکی پیرۆزە بۆ زیاتر ئاسوودەبوونی جیهانی ئیسلامی‌و راهێنانی نەوەی نوێ بۆ سەر گیانی برایەتی‌و لێبوردوویی‌و بەکارهێنانی هۆش.. لە هەموو ئەوانەشدا ئەگەر بکرێت وێنەیەکی نوێ لەجیهانی ئیسلامی دروست دەبێ.. وێنەیەك لەیەکبوونی ئیسلام و تایبەتمەندییە شارستانییەکەی.

# خوێنەری خۆشەویست

## کە بەبابەتە بەسوودو بە پێزەکانت بەشداری لە( خۆری ئیسلام ) دەکەیت، دەبێ ئاگاداری ئەم خاڵانەی خوارەوە بیت:

١–ئەو بابەتانەی بەناوی نووسەرە بەڕێزەکانیان بڵاو دەبنەوە جگە لەسەروتار گوزارشت لە بۆچوونی خۆیان دەکات و خۆری ئیسلام لێی بەرپرسیار نییە.

٢–نابێ ئەو بابەتە پێشتر لە هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێك بڵاو بووبێتەوە.

٣–بابەتەکان بەخەتێکی خۆش و تەنها لەسەر یەك ڕووی کاغەز بنووسرێن و دێڕیش باز بدرێت.

٤–ئاماژە بەسەرچاوەکان بکرێت و، ناوی نووسەری سەرچاوەکان بنوسرێت و، ئەگەر وەرگێڕان بێت جیا لەوانە دەبێت دەقی ئەسڵی وتارە وەرگێڕدراوەکە بەفۆتۆکۆپی لەگەڵ ڕەوانە بکرێت.

٥–ئاماژە بەناوی سورەتەکان و، ژمارەی ئایەتەکان و، ناوی فەرموودە گێڕەوان بکرێت.

٦–خۆری ئیسلام مافی داڕشتنەوەو چاککردنی زمانەوانی بەخۆی دەدات.

٧– ئەو بابەتانەی کە بەدەستمان ئەگات (بڵاو بکرێنەوە یاخود نا) دەقەکانیان بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێتەوە.



# تیشکێك بۆ کەلتووری ئیسلامی

هەیفا بەرزنجی

## بەشی یەکەم:-

کەلتووری ئیسلامی، جیا لەئاین، ئەوە نییە پێویست بێ‌و مرۆڤ خۆی رێکی بخات ئەوەی لەگەڵی دەگونجێ وەری بگرێ، ئەگەر وا نەبێ رەنگە کەلتوورەکە لەزۆر باردا پێچەوانەی ئایینەکە خۆی بگەیەنێ‌و ببێتە هۆی ئانەوەی کۆسپی تێگەیەشتن.

باسکردن لەکەلتووری ئیسلامی مەسەلەیەکەو زەمانێکە پێویست بوو باسی لێوە بکرێت و بەپێی شەریعەتی ئیسلامی بگەرێینەوە سەری، ئیسلام و کەلتووری ئیسلامی دوو بنەمای جیاوازن و مەرج نییە کە ئیسلامییەتی پەیرەوکرا کەلتوورەکەش لەهەموو بارێکدا پەیرەو بکرێ، کەواتە کەلتووری ئیسلامی وەکو ئیسلام نییە، سەرەڕای ئەوەش ئەو پەیوەندییەی نێوانیان پەیوەندییەکی ئەندامی خۆییە، بەجۆرێك بەبێ بوونی ئیسلام لەو شوێنە هیچ کەلتوورێکی ئیسلامی نایەتە ئارا، ئیسلام ئەو میحوەرە سەرەکییەیە کە کەلتووری لێوە دەخولێتەوە.

ئیسلام هەروەکو هەمووومان دەزانین ئایینێکی ئاسمانییە کە خوای گەورە بەسروش بۆ پێغەمبەرمان محەممەد (د.خ)ی ناردووە، داواشی لێکردووە ئەو ئایینە بەخەڵك بگەیەنێ‌و بانگەوازی باوەڕی ئیسلام بکات.

هەرچی کەلتوورەکەیە -پێویستە بزانین- ئەنجامی زرنگی‌و کاردانەوەی هۆشی چەندین پشتی لەوەو پێشە لەڕوانگەی ئیسلامەوە هەڵێنجراوە.

## پەیوەندی لەنێوان ئایین و کەلتوور:-

جیاوازی نێوان ئەو دوو بابەتە لە دووتوێی ئەم باسە لە دوو خاڵدا خۆی دەگرێتەوە:

یەکەم: ئەو سەرچاوەیە کە هەریەك لەئیسلام و کەلتووری ئیسلامی لێوە دەرچووە.

دووەم: ئەو هێزەی کە هەریەك لەئیسلام و کەلتووری ئیسلامی هەیەتی بۆ پابەند کردنی خەڵك بە پابەندبوونێکی ئایینی.

هەروەکو دەزانین سەرچاوەی ئیسلام هەر لەلایەن خواوەیەو هۆشی مرۆڤ بۆی ناکرێ ئایینێك دروست بکات، بەڵکو بەگەڕخستنی هۆشی بۆ ئەوەیە ئەو ئایینە شی بکاتەوەو بیگەیەنێتە گوێی کەسانی تر. ئەگەر نا هەر کەسێکیش دەست بۆ ئەوە ببات ئایینێك دابهێنێ دیسان ئەوانە کەسێکن دەست درێژی دەکەنە سەر مافەکانی پەروەردگار. هەرچی سەرچاوەی کەلتووری ئیسلامییە -هەروەکو باسمان کرد هۆشی مرۆڤە، ئەو هۆشەی کە لەئیسلام گەیشتووەو کاری لێکراوە.

## پێویست نەبوونی کەلتوور:-

ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد دەربارەی سەرچاوەی هەر یەکێك لەو دوو تەوەرەیە سەبارەت بە هێزی پێویست بوون و پابەند بوونی ئایینیش کە هەر یەك لەئیسلام و کەلتووری ئیسلام هەیانە، بەو شێوەیەی خوارەوە دەبێ:

ئەوەی هێزو دەسەڵاتی پابەند بوونی ئایینی هەیە دەبێ ئاین بێت، هەروەکو پیرۆزیشە.. کەچی ئەوەی تر هێزو دەسەڵاتێکی تری پابەند نەبوونی هەیە کە پابەند بوونی ئەدەبییە. بەو مانایەی ئەوەی دوایین دەتوانرێ دەستکاری بکرێ‌و لەزۆر باریشدا هەڵەو راستی لەخۆیەوە دەگرێ‌و هێزی پابەند بوونەکەش لەگەڵ بەرژەوەندی دەگۆڕێ‌و ئەو کەلتورە بەپێی هاتن و بەسەرچوونی سەردەمی باوو باپیران دەگۆڕێ.



لێرەدا بەپێی رەچاوکردنی شەریعەتی ئیسلامی باسی چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئیسلام و کەلتوورەکەی دەکەین:-

هەنگاوی یەکەم بۆ ئەو مەبەستە پێویستە، لەنێوان ناسینی شەریعەتی ئیسلامیو بە شەریعەتکردنی ئیسلامی (التشريع) جیاوازی بکەین، لەبارێکدا کە شەریعەتی ئیسلامی سەرچاوەکەی سروشتێکی خواییە و بۆ پێغەمبەرمان(د.خ) نێردراوە، بەو واتایەی شەریعەت تێکستێکی رەهای بەڵگەدارە.

هەرچی بەشەریعەتکردنە ناتوانین بلێین تێکستێکە، کەواتە رەهای تێدانییە دەتوانرێت بگۆردرێت و بەپێی پارسەنگی هۆشی مرۆڤ دابنرێت.

زانایانی فیقهی ئیسلامی سەرچاوەکانی بە شەریعەت کردنیان بە چوار جۆر دەستنیشان کردووە:-

قورئان و سوننەت کە تێکستەکەن، (الاجماع والقياس)یش کە ئەو بارەن بیری مرۆڤی بۆ دەخرێتە گەڕ.

دواتر زانایانی ئوسولی، ئایینی ئیسلامیان بەوە پێناسە کردووە کە عەقیدەو شەریعەتە، شەریعەتیشیان کردووە بە دوو بەش: بەشێکی پەرستنە، بەشەکەی تریش کارپێکردنیەتی.

سەبارەت بەو دابەش کردنە هەردوو لایەنی زاناکان راستن و نابێ لەقسەیان دەربچین و دەبێ بەپێی بەرنامەی دارێژراوی ئەوان کار بەئیسلام و کەلتوورەکەی بکەین و لەگەڵ ژیانماندا بیسوپێنین.

بەو بارە بێ باسەکە ئاسانترەو خوێنەری بەڕێز بۆی روون بۆتەوە کە هۆشی مرۆڤ خرایە گەڕ تەنها دەتوانێ شتێك دروست بکات ئەویش کەلتوورەکەیە، کە ئەویش دەشێ دەستکاری بکرێت.

**ئیسلام و کەلتووری ئیسلامی دوو بنەمای جیاوازن و مەرج نییە کە ئیسلامیەتی پەیڕەوکرا کەلتوورەکەش لە هەموو بارێکدا پەیڕەو بکرێ**

بێگومان ئێمە هەموو ئەو زانیاریانەمان لە دێر زەمانەوە بۆ ماوەتەوە، و ئەو کەلتوورە بووەتە موڵکی خۆمان هەروەکو موڵکی خۆشمانە دەتوانین بەگفتوگۆو دەمەتەقێ دەستکاری بکەین، بەڵام بۆ ئەمە مەرجە ئەو دەستکاری کردنە لەبەرژەوەندی گشتیدابێت، بەپێچەوانەوەش کارێکی نارەوایەو زیان بەبەرژەوەندی گشتی دەگەیەنێ.

لەکۆنەوە زانایانی ئوسولی فیقهی گوتویانە:- گۆڕانی حوکمەکان بەگۆڕانی کاتەکانەوە بەندە.. بەو واتایەی هەر سەردەمێك جۆرێك لە بەرژەوەندی شیاوو نەشیاو دیاری دەکات، مرۆڤیش پابەندە بەوەی حوکمێکی نوێ دابنێت کە بگونجێت لەگەڵ ئەو سەردەمەی لێی دەژیێ.

### نەگۆڕینی تێکست

ئەگەر ئیسلام دوا ئایین نەبوایە، پێغەمبەرمان محەممەد(د.خ) دوا پێغەمبەر نەبوایە خوای گەورە گۆڕان و دەستکاری لەئیسلامدا دەکرد: هەروەکو سەبارەت بەئایینەکانی تر کراوەو دەستکاری شەریعەت و تێکستەکانیان کراوە. بەڵام ئەوە وامان لێ دەکات ئەو باسە لەسەر بنچینەیەکی تردا باس بکەین کە بەشەریعەت کردنی هەندێ لەلایەنەکانە ئەویش بەهۆی توانای هۆشەکی مرۆڤ کە گۆڕانکاریان تێدا دروست بکات، جا ئایا مرۆڤ ئەو توانایەی هەیە؟ بۆ ئەو مەسەلەیە ئێمەش لەسەر رێرەوی زانایانی ئوسولی ئایین دەڕۆین کە دەڵێن ئیسلام عەقیدەو شەریعەتە، شەریعەتیش پەرستن و کارپێکردنە.



# با لە دارشتنی نووسینەکانمان کوردیانە بیر بکەینەوە

عەبدولڕەحمان مەعروف

لەخوا ترسان و خزمەتکردن بەئایین فرە ڕێگەی هەس، کە هەڵبەتە ڕێگایەك تا ڕێگایەکی دیکە سەخت و دژوارو ئەرکی قورسترە. دوا ڕۆژیش پاداشتی قەڵەوترو بەرهەمی پتر بەر خۆ ماندووکردن و قوربانی بەربڵاوتر دەکەوێت. کورد دەڵێ: چ بچێنی ئەوە دەدوریتەوە. ئەگەر ئەوەی دەشیچێنی ئارەقەی بۆ بڕێژێت و لەزیوان و شتی نامۆ بژاری بکەیت، سەرەنجام لەبەری دەحەسێیتەوە.

یەکێك لە دەلیڤەکانی خزمەتکردنیش بواری نووسین و وەرگێڕان و قووڵبوونەوەیە لەنێو ڕۆشنبیری و بابەتی ئایینی، کە ئەمەش هەروا کارێکی ئاسان و سانا نییەو، بەبێ شەونخوونی و شەکەتبوون ماڵی نابێت، بەخۆی لەدەرگای کەس نادات، دەبێ تۆ بەدوایدا ڕاکەیت، وێل و تامەزرۆی بیت. باوەشی خۆشەویستی و دونیای ئارەزوو بتجولێنێت، ئەوسا دەکرێت هەنگاو هەلبێنیتەوەو دەستیش بۆ قەڵەم بەریت.

تا بەئەمڕۆش هەول و خزمەتی گەورەو نووسەرو زانای ناودارو هەڵکەوتوو لەسەرجەم بوارەکانی شەرع و تەفسیرو فەرموودەو ڕاڤەکردندا دەبیندرێن. هەڵبەتە لەبەر ئەوەی زمانی قورئان و ئیسلام بەعارەبی بوو لەنێو نەتەوەی عارەب سەری هەڵدا، سەرەتا کارکردنیش لەم بوارەدا بەزمانی قورئان بوو، هەر بۆیەش چەندین زانای گەورەی وەك (امام بخاري، ابن خلكان، ابن مستوفي، سبويه، نيسابوري. . .) دەبینین کە عارەب نین و خۆشەویستیان بۆ ئیسلام و قورئان باوەڕەکەیان ئەم ڕێگایەی بۆ دەست نیشان کردوون. بەڵام دواتر کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام سنووری دوورگەی عارەب و وڵاتی عارەبی بەزاندو گەشەی سەندو بڵاو بۆوە، چەندین نەتەوەو زمانی جیاجیا هاتنە نێو بازنەی ئیسلام و ئیسلامیان بەئایینی خۆیان قبوڵ کردو هەڵبژارد، ئەوە بۆ حاڵی بوون لەناوەڕۆك و زمانی قورئان و فەرموودەکانی سەروەرمان محەممەد(د.خ) و شەرع و لایەنە بەرفراوانەکانی ئیسلام و بۆ ئەوانەی بەزمانی عارەبی ئاشنا نین و سەری لێ دەرناکەن، لەهەر یەکێ لەم نەتەوانە زاناو کەڵەپیاوی مەزن و وەرگێڕی بەتوانا هاتنە پێشەوە، کە وێڕای خزمەت و پەرەپێدان بەئیسلام، خزمەتێکی یەکجار مەزن و بەرچاویشیان بەزمانی دایك و نەتەوەکەیان کردووە.

منیش لەم دەروازەیەوە گەرەکمە بخزێمە نێو کرۆکی مەبەست و نووسینەکەمەوە، ئەویش هەوڵ و تەقەلای ئەو کۆمەڵە زاناو نووسەرو زمانزان و وەرگێڕە کوردەیە، کە لەم بوارەدا بەراستی شوێن پەنجەیان دیارەو تاکوردیش مابێ قەرزباریان دەبێت. بەوەی زمانی کوردیان پاراوو دەوڵەمەندتر کردووە. ئەوەی لێرەشدا دەمەوێ جەختی لەسەر بکەمەوە زمانە. زمان دیاردەیەکە مەودایەکی بەرفراوان و لێك ئاڵۆزکاوی هەیەو



سەرەتاو کۆتایی دیارنییە. زمان لەگەڵ ڕەوڕەوەی مێژوو هاتۆتە پێشەوە و هاوتەریب لەگەڵ مرۆڤ هەنگاوی ناوەو کاڵای فڕێداوەو کراسی تازەی لەبەر خۆی کردووە، بەپێی قۆناغ گۆڕانی بەخۆوە دیووە.

زمان کەرەستەی لێك حاڵی بوون و تێگەیشتنی نێوان مرۆڤەکانە. هەڵبەتە مرۆڤ لەنێو بوونەوەرو گیان لەبەرەکانی دیکە تاکە بەوەی دەتوانێ بئاخڤێ‌و خاوەن تایبەتمەندی زمانە. زمانیش ڕۆڵی فرە کاریگەرو پڕ بایەخ لەژیانی ئادەمیزاد دەگێڕێت. هەموو بزاڤ و کارو چالاکییە جڤاکی‌و عەقلییەکانیش لەڕێگای زمانەوە بەئەنجام دەگەن. کە سەرەڕای پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانیش پێوەندی نێوان مرۆڤ و دەوروبەریش دیاری دەکات. لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین زمان بەکۆڵەگەی سەرەکی کۆمەڵ و سیماو بنەمای تایبەتی نەتەوەو کۆمەڵ بژمێرین. ئەوەش دەزانین کە زمان هەڵگرو پارێزەری کلتوورو شارستانیەت و تەواوی زانیاری‌و زانستەکانە. هەر بۆیە زمان هەمیشە بەمجۆرە پڕبایەخەوە چاوی لێکراوە.

دەمەوێ بڵێم ئەوانە تائێستا لەبواری نووسین و وەرگێڕان و تەفسیری قورئانی پیرۆزدا کاریان کردووەو یان هەوڵ و کۆششیان بەڕێوەیە، کەس لاری لەزانایی‌و شارەزایی ئایینی‌و خزمەتی ئەوان نییەو بەری ڕۆژیش بەبێژینگ ناگیرێ‌و خودای گەورەش بەمەبەستی ڕاستەقینەی ژووری ژوورەوەی دڵەکانیان ئاگادارە. بەڵام زمانی هەریەکێ لەمامۆستایان (عەبدولکەریم مودەڕیس و شێخ محەممەدی خاڵ و سەدیق بۆرەکەیی هەژار موکریانی‌و... تاد) جیاوازەو سەلیقەو زمان پاراوی هەریەکێکیان دیارە. لێرەدا من خۆم دەپارێزم لەهەموو لایەن و مەسەلەیەکی ئەو بەڕێزانەو هەموو ئەوانەی لەم بوارەدا خزمەت دەکەن تەنیاو تەنیا قسەم لەسەر شێوازی نووسین و داڕشتن و زمانەکەیەو، کە سەلیقە زمانزانییە. هەرچەندە خزمەتی یەکێکی وەك مامۆستا عەبدولکەریم مودەڕیس زیاترەو زاناو شارەزاتر بێ لەبواری ئایین، بەڵام بۆ نموونە زمانەکەی مامۆستا هەژار زۆر کوردیانەترو پاراوو خۆشترە. بۆیە دەکرێ لەدوای ئەوەی چەندین زاناو مامۆستای ئایینی ڕێچەیان شکاندو لەم بوارەدا خزمەتیان بەزمانەکەیان کردو چاوی خوێندەواری کوردیان بەکارەکانیان ڕۆشن کردەوەو ڕەتی ئەوەیان کردەوە کە زمانەکەیان بۆ وەرگێڕان و نووسین و بواری ئایینی ناشێت. ئەوا مامۆستا هەژاریش دەرکەوت و قورئانی بەم زمانە شیرینە وەرگێڕاو هەنگاوێکی دیکەی هەڵێنایەوەو ڕەوتەکەی پێشڤە برد دەبا هەوڵ و تەقەلای گەورەترو هەنگاوی بەگوڕتر بۆ بەکوردی کردنی زۆر بوارو بابەت و زاراوەو لایەن کە تائێستا کەس پەنجەی بۆ درێژ نەکردووە بدرێت. بەواتای لەمەودوا هەوڵی چۆنایەتی بدرێت نەك هەرچەندایەتی‌و شت لەپێناو شت. هەندێك بوار هەیە کتێبخانەی کوردی زۆر زۆر لێیەوە هەژارەو کەمتر زانایان دەستی بۆ دەبەن، تاکو ئەمڕۆ ژمارەی تەفسیرەکانی قورئانی پیرۆز بەکوردی لەچاو بوارەکانی دیکە یەکجار زیاترە، کەواتە خوێنەری کوردی موسڵمان چاوی لەو لایەن و بابەتانەیە کە نەکراون بەکوردی‌و شارەزای لێ نییە. ڕەنگە لەهەندێ تەوەرو بواری شەرع و ئایین کارەکە زۆر سەخت و تاقەت پڕوکێنیش بێت، بەڵام خۆ بەکوردی کردن مەسەلە خودی وشە نییە، ئەوەندی وەرگێڕو نووسەر بتوانێت بەسەر زمانەکەی خۆیدا زاڵ بێت و لەکاتی نووسینەوەی کوردیانە بیربکاتەوەو بنەماو ڕێسای ڕێزمان و نووسینی کوردی بەکاربێنێت. تۆی کوردی موسڵمان لەبەر ئەوەی لەکۆن و لەمێژووی نەتەوەکەتدا نوێژو ڕۆژوو هەبووە بەر لەئیسلام بوون، بۆیە زۆر ئاسایی بووە بۆ کاتی بەکوردی

کردنی ئەم وشانە، بەڵام دەبیٚ زەکات و حەجی نەبووبێت، بۆیە تاکو ئەمڕۆش ئەم وشانەو چەندین وشەی دیکەی هەر وەکو خۆیان بەکاربێن. ئەگەر لەمڕۆی جیهانی تەکنەلۆژیاو پێشکەوتن بڕوانین سەدان و بگرە هەزاران وشەی وەك (تەلەفۆن و تەلەفزیۆن و ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەرو دکتۆرو تالاسیمیاو. . .) کە هەموو جیهان هەمان وشە بەکار دێنێت، کەواتە ئێمە لێرەدا کێشەمان لەسەر خودی وشەو زاراوە نییە، بەڵکو نیازمان لەوەیە با شێوازی نووسین و وەرگێڕانمان کوردی بێت و کوردی زوبان ماندوو نەکەین و بەئاسانی تێمان بگات، لەوەی چەندین وشەی -ئەگەرچی کوردی نین- چەسپیوو ئاشنا بەزارو گوتەی خەڵك هەن ناکریٚ وشەی داتاشراو نێو کون و کەلەبەری فەرهەنگەکانیان بخەینە شوێن، هەموو زمان و نەتەوەیەك پڕیەتی لەوشەی بیانیو دەرودراوسیٚ. قورئانی پیرۆز لەکاتێکدا زمانەکەی عەرەبییە: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا/ سورة يوسف/٢﴾ بەڵام دەیان وشەی نەژاد رۆمی، سانسکریتی، پەهلەوی، یۆنانی، کوردیو ئارامی کۆنی تێدایە وەکو (برهان، دين، ملكوت، طوبى، رضوان، فردوس، ارائك، زرابى، نمارق، كافور، كأس، قوارير، زنجبيل، سندس، استبرق، مائده، رزق، زخرف، سراج، صراط، قسطاس، رهبان، داب، بيعه، كنز، سراويل، دراهم، بخس، امد، ابد، صدقات، قطمير، اصنام، جناح، سخط، برزخ، جحيم، تنور، زبانيه، جهنم، زمهرير، صرصر، شواظ، شنار، قمطرير، غساق، ضنك، شئ، كهل، كهف، دلو، يم و سراب و هى تريش.) بۆیە دیسانەوە دووپاتی دەکەمەوە، کە با لەمەودوا لەنووسین و کارەکانماندا جەخت بکەینە سەر بنەماو ڕێساکانی زمانی کوردیو لەداڕشتن و رستەکانمان کوردیانە بیربکەینەوە، ئەوەی لێرەشدا بەپێویستی دەزانم لیژنەیەکی پسپۆڕ و لێزان و شارەزا بەئایینیش لەمامۆستایانی ئایینیو وەزارەتی ئەوقاف پێك بێت -کە درەنگە زوو نییە- بۆ بەکوردی کردنی زاراوەو هەندیٚ مەسەلەو بابەتی گرنگ و پێویست. وەك دەبینین ئەمڕۆ لەزۆربەی دام و دەزگاکانی وەزارەتەکانی حکومەتی هەرێم بۆ بەکوردی کردنی نووسراو نووسین و شتەکانی دیکە لەکاردایە.

دواشتیش دەمەویٚ لەوەرگێڕانەکەی قورئانی پیرۆز لەلایەن مامۆستا هەژارەوە کۆتایی بەم ئایەتە بێنم، کە هەر بۆ نموونە لەزمان و کوردییەکەی بڕوانن. خۆ ئەگەر تەواوی وەرگێڕانەکەش بخوێننەوە ئینجا دەزانن ئەم پیاوە چەندە زمانزان و بەسەلیقە وردەکاربووە.

﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لاَ شَرْقِيَّةٍ وَلاَ غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُورٌ عَلَى نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ/ سورة النور/٣٥﴾

کە کوردیەکەی بەمجۆرەیە:

(خودا ڕووناکی ئاسمانەکان و زەمینە. ڕووناکی ئەو وەك تاقێکە چرای تێدا هەڵکرابیٚ، چرا لەجامێکدا بیٚ، جامەکە وەك ئەستێرەیەك تروسکەی بیٚو ماکی چرا لەزەیتونێکی مبارەك دەس کەوتبیٚ، کە دارەکەی نەهەمیشە بەرەو ڕۆژەو نەهەمیشە لە نزارە. تۆ ئێژی ڕۆنی چراکە -بەبیٚ ئاگر تخون کەوتن- تیشك دەدا، ڕووناکی لەبان ڕووناکی. خودا هەر کەسیٚ حەز بکا، ڕووناکی خۆی نیشان دەدا. خودا بۆ مەردم نەزیلان دێنێتەوە. خوا بەهەموو شت دەزانیٚ.)

**سەرچاوەکان:**

١-قورئانی پیرۆز.
٢-قورئانی پیرۆز، وەرگێرانی مامۆستا هەژار.
٣-هەمبانە بۆرینەی مامۆستا هەژار.



# وەقفی ئیسلامی لە وڵاتی بولگاریا

سیروان ئەحمەد

وەقــف یەکێکــە لــەدەزگا خــەیریو کۆمەڵایەتییــە گرنگــەکانی کۆمەڵگــە، بــەر لەهاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، دیاردەی وەقف هەرهەبووە، بەڵام لەســەردەمی ئیســلامدا زیــاتر برەوی پێدراو مۆرکی سیستەمی بــەخۆوە گــرت، ئــەویش لەبــەر زۆری ئەو ئایەت و حەدیسانەی کە هـانی موسڵمانان دەدات بـۆ خــێرو چاکــەو هاوکــاری کۆمەڵایەتی، بۆیە هـەر شـوێنێك ئـایینی ئیسـلامی پێگەیشـتبێ، وەقــف لایــەنێکی پرشــنگداری بەرچاوی ژیانی ئەو کۆمەڵگەیەی پێکهێناوەو رۆڵێکی کاریگــەری بینیــوە لەبەمــەدەنی کردنیــدا، یــەکێك لــەو وڵاتانــەی کــە وەقــف تیایدا بەرچاوەو، لەکاتی خۆیدا رۆڵـی کاریگــەری بینیــوە وڵاتــی بولگاریایە:

بولگاریــا یەکێکــە لــەوڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات، هەرچــەندە بــەوڵاتێکی ئیســلامی لەقەڵــەم نادرێت بەڵام موسڵمانان تیــایدا رێژەیەکی بەرچاو پێکدەهێنن و، بـۆ نزیکـەی (٥٠٠) سـاڵ لــەژێر دەسـتی عوسمانییــەکاندا بــوون لــەو ماوەیەشــدا وەقــف وەك دەزگایــەکی کۆمەڵایــەتی ســەری هــەڵداوەو گەشــەی کــردووە، بەشــدارییەکی چالاکانەشـــی لــەژیانی رۆژانــەی خــەڵکدا کردووە، بــەڵام بەگرتنــە دەسـتی جڵــەوی دەســەڵات لەلایــەن کۆمۆنیســتەکانەوە، بولگاریــا کەوتــە فەلــەکی ســۆڤیەتی جارانەوە، لەژێر بارودۆخی نوێدا موسوڵمانان بەگشتیو وەقـف و مزگەوتـەکان بەتایبـەتی کەوتنـە بــەر شــاڵاوی کــاول کــردن و قەدەغــە کــردن و دەســت بەسەرداگرتن، بـۆ نموونـە وێنـە فۆتۆگرافییە کۆنەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کاتی خۆی لەسەرەتای ســەدەی نۆزدەهــەمدا تەنــها لەشـاری (سـۆفیا)ی پایتـەختدا (٨٩) مزگــەوت هــەبووە، بــەڵام ئێستا تەنها مزگـەوتی (سـۆفیا) ماوە، ئـەم مزگەوتـەش گـۆڕا بـۆ (مۆزەخانــە) کــە تائێســتاش بیناسازی ئیسلامی پێوە دیارە.

هــەر لەمبارەیــەوە (فیکــرەت چــیرکیزۆف)ی بەڕێوەبــەری ئــەوقاف لــەبولگاریا دەڵێــت: (شـایەتە مێژووییـەکان ئامـاژە بــەوە دەکــەن کــە کــاول کردنــی بەشێك لەوەقفـەکان دەگەڕێتـەوە بــۆ ســەرەتای رزگــاربوونی بولگارەکــان لــەژێر دەســتی عوسمانییەکان، لـەو کاتـەدا زۆر مزگـەوت روخێنرا، لەسـەردەمی کۆمۆنیستەکانیشدا، موڵکەکانی وەقف دەستیان بەسەرداگیرا یان لـەژێر نـاوی (یاسـای خۆمـاڵی کـردن)دا فـەوتێندران، ئیتر لـەو



## لەبولگاریا كاتی خۆی (٢٥٣) مزگەوت هەبووە، هەر مزگەوتێكیش خاوەنی زەوی كشتوكاڵی یان خانوبەرە یان دوكانی خۆی بووە

كاتـەوە زۆرێـك لەموڵكـەكان لەدەست دران). بەڵام ئەم رەوشە تا سەر بەردەوام نەبوو، ئەوە بوو هـەر لەگـەڵ هەرەسـی یـەكێتی سـۆڤیەتدا، تـەواوی رژێمـەكانی ئـەوروپای رۆژهـەڵاتیش وەكـو گـەڵای دار هـەڵوەرین و، گۆرانكارییـەكی تاڕادەیـەك بنەڕەتی هاتە ئاراوە، بولگاریاش یەكێك بوو لەو وڵاتانە، بولگاریا بۆ ئەوەی رووی خۆی وەرگێڕێت بـەرەو جیـهانی بـازاڕی ئـازاد هەندێ رێو شوێنی گرتەبەر وەك گەڕانەوەی ئەو موڵكانەی كـاتی خـۆی لەسـەردەمی كۆمۆنیستەكاندا (خۆمـاڵی) كرابوون بـۆ خاوەنـەكانیان لەناویشـیاندا وەقفـە ئیسـلامییەكان ئـەویش بەپێی یاسـایەك كـە تیـایدا هـاتووە: (گەڕانـەوەی موڵكەكان یان وەك خۆی دەبێت یـان قـەرەبوو وەردەگـرن، ئـەم گەڕانەوەش تەنها بـۆ تاكـەكان نـابێت، بـەڵكو بـۆ رێكخـراو و دەزگـا ئاینییـەكانیش)، لـەم چوارچێوەیـەدا یاسـایەكەش ئەوقافە ئیسلامییەكانی گرتـەوە كـە ئێجگـار زۆرن بەشـێوەیەك (مسـتەفا حـاجی عـەلیش موفتی گشتی بولگاریـا) دەڵێت: ئەوقافـەكانی بولگاریـا ئـەوەندە زۆرن كـە نـەك هـەر بەشـی چارەسـەركردنی گیروگرفتـە مادیـەكانی بولگاریـا دەكـات، بـەڵكو بەشـی چارەسـەری گیروگرفتـەكانی تـەواوی ئـەوروپای رۆژهـەڵات دەكـات، چونكە لـەبولگاریا كـاتی خـۆی (٢٥٣) مزگـەوت هـەبووە، هـەر مزگـەوتێكیش خـاوەنی زەوی كشـتوكاڵی یـان خانوبـەرە یـان دوكـانی خـۆی بـووە. ئێسـتاش گـیروگرفت لەوەدایـە كـە تەنـها بەشـێكی كـەمی ئـەم ئەوقافانـە گەڕێنراوەتـەوە ئـەویش لەبـەر كـەمی ئـەو دۆكیۆمێنتانـەی كـە موڵكیەتی ئەم ئەوقافانە دەسـەلمێنێت هـەروەها حكومـەت دان بەهـەندێ لـەو دۆكیۆمێنتانـەدا دەنێـت و، دان بەهـەندێكیاندا نـانێت، هاوكـات هەندێكیشـیان تێداچوون.

هـەر چۆنێك بێـت بـارودۆخی وەقفەكان لەوڵاتی بولگاریا بەرەو پێش دەچێت و موسڵمانانی ئەو وڵاتـەش خوازیـارن تـەواوی موڵكەكان بگەڕێتەوە ژێر سایەی (وەقـف) تـا رۆڵـی دیـاریكراوی خـۆی ببینێـت لەباشـتر كردنـی بژێویـان و، ببێتـە دەزگایـەكی چـالاكی ژیـانی كۆمەڵایەتیان.

> **لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا تەنها لەشاری (سۆفیا)ی پایتەختدا (٨٩) مزگەوت هەبووە، بەڵام ئێستا تەنها مزگەوتی (سۆفیا) ماوە، ئەم مزگەوتەش گۆڕا بۆ (مۆزەخانە) كە تائێستاش بیناسازی ئیسلامی پێوە دیارە**

سوود لە:

بەرنامەی (الملـف الاسـبوعي) كەناڵی جەزیرە وەرگیراوە.





# ساڵی چوارەمی خۆری ئیسلام و هێشتا واقعی بوون

جەعفەر گوانی

لەم ژمارەی (١٣) سێزدەهەمەدا خۆری ئیسلام دەکەوێتە دەسپێکی ساڵی چوارەمییەوە کە ژمارەی یەکەمی لەتەمووزی ساڵی ١٩٩٨ دەرچوو تاکو ئان و ساتی ئێستا هەموو وەرزێك دەرچووەو توانیویەتی لەکاتی خۆشیدا بەدەستی خوێنەران دەگات، ئەگەرچی هەندێك جار لەبەر هاتنەپێشی بۆنەو رووداو لەوانەیە کەمێك دواکەوتبێت .لێرەدا بەبۆنەی چوونە ناو ساڵی چوارەمی تەمەنی خۆی گەرەکمە هەندێك سەرە قەڵەم بنووسم، بەڵکو بتوانم هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی دەربڕم.

١-خۆری ئیسلام توانی ببێتە پێشەنگ و داهێنەری تێکەڵکردنی بیرۆکەی (ئیسلامی-کوردی) یان بەشێوەیەکی دیکە بڵێین توانی لەنێو لاپەڕەکانیدا هەردوو بیرۆکەی ئایینیو نەتەوایەتی تێکەڵ بەیەکدی بکات، چونکە تا ئەو کاتە رۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەکان بەسەر سێ تەوەردا دابەش بوون، هەیانە بەهیچ جۆرێك خۆی لەقەرەی لەیەك نزیکیو لەیەك دووری دین و نەتەوە نادات، هەشیانە پێی وایە ئیسلامێتیو کوردایەتی دوو شتی تەریبن و مرۆڤی موسڵمان نابێ باس لەکێشەو دەردەسەرییەکانی نەتەوایەتی بکات، کۆمەڵی سێیەم بەپێچەوانەی کۆمەڵی دووەم پێیان وایە ئایین پەروەری بۆتە هۆی مەینەتیەکانی کورد. بەڵام خۆری ئیسلام رووی راستەقینەی ئەم بۆچوونانەی وەدیار خست و پیشانیدا کە ئیسلامەتیو نەتەوایەتی دەکرێ زۆر بەباشی لێکدی گرێ بدرێن بەنموونەی هەزاران کەڵە پیاو. ئێستاش خۆری ئیسلام تەوەرێکی کردۆتەوە کە خۆی داهێنەریەتی، ئەویش بیرۆکەی ناوی کوردییە. لێرەدا بۆ مێژوو دەڵێم خۆری ئیسلام داهێنەرەو کەس نابێ ئەو مافەی لێ زەوت بکات.

٢-لەرووی فتواوە تاکو ئێستا باش بووە لەزۆربەی ژمارەکان باسێکی فتوای هەبووە، بەڵام خۆزی دەکرایە گۆشەیەك و لەهەموو ژمارەکانیدا فتوای دەربارەی شتێکی ئاڵۆزو بەربڵاو دەردەکرد، بەجۆرێك وای لەخوێنەر بکردایە لەو ژمارەیە تا ژمارەی دیکە چاوەڕوانی فتوای نوێ بووایە. هەرچەندە گۆشەیەك کراوەتەوە دەربارەی پرسیارو وەڵام، بەڵام دەکرێ گۆشەیەك تەنها فتوا بووایە.



٣-تاكو ئێستا هیچ گۆڤارو رۆژنامەیەك وەكو پێویست بایەخیان بەرۆڵی زانایانی كوردی ئیسلامی نەداوە، مەگەر (دەنگی زانا) ئەویش دوای وەفاتیان وەكو ژیاننامە، بەڵام خۆری ئیسلام وەك پیشەی هەمیشەیی بەزیندوێتیو رووبەروو زانایەك وەقسە دێنێت.

٤-خۆری ئیسلام تاكو ئێستا لەوانەیە لەرووی چاپەمەنیو رێزمانەوە هەڵەی تێدا هەبووبێت، بەڵام بۆ چەند ژمارەیەك دەچێت ئەمەشی بەرەو ئاقاری نەمان بردووە. بەتایبەتیش كێشەی ئایەتەكان كە زۆر جار ئایەت بەهەڵە لەچاپ دەدرا، ئەوە بوو لەبەر زۆری هەڵەی ئایەتەكان ژمارەی ٦ی كەمێك بڵاوكرایەوە، كەچی ئێستا بەهۆی (سیدی)و لەرێی (كۆمپیوتەر)ەوە نەك هەر ئایەتەكان بەهەڵە نانوسرێنەوە، بەڵكو ژمارەو ژێرو بۆریشی بۆ دیاری دەكرێت، لەگەڵ ناوی سورەتەكانیش.

٥-دەبوایە خۆری ئیسلام لە هەر ژمارەیەكیدا چەند پەرتوكێكی رۆشنبیری ئیسلامی عەرزبكردبایە، چونكە لەرێی عەرزەوە خەڵك زیاتر ئامەزرۆیان دەبێت.

٦-هەروەها ئەگەر بكرابا خۆری ئیسلام خەڵكێكی زۆر زیرەكی دەعوەت بكردبا بۆ بابەت نووسین، چونكە خۆش نییە زۆربەی تەنها نووسەری كەم بەرهەم بن، مەبەستم ئەوە نییە نووسەرە تازەكان وەلاوە بندرێن، بەپێچەوانەوە دەبێ خۆری ئیسلام قوتابخانەیەك بێت بۆ پێگەیاندنی نووسەری ئیسلامی یان هەربوارێكی دیكە..




٧-ئەوەی زۆر منی دڵخۆش كرد گرنگیدانی خۆری ئیسلامە بەزمانی رەسەنی كوردیو خۆ دوورگرتن لەتێكەڵ كردنی زمانی بێگانان چەند خۆشە قورئانی مامۆستا هەژار لە هەمووی (٥٠) پەنجا وشەی بێگانان نابینیت.

٨-دەكرێ لێرە بەدواوە خۆری ئیسلام گرنگی بەدیمانەو ریپۆرتاژ بدات لەبواری كۆمەڵایەتیو ئافرەتان و ئەو دیاردانەی ئێستا بڵاو بوونەتەوە وەك دیاردەی كۆچكردن و هەندێك لەو كردەوانەی پەیوەندی بەفتوای ئیسلامییەوە هەیە. چونكە تاكو ئێستا بەكەمی نەبێت ریپۆرتاژو دیمانەی بڵاوكردۆتەوە.

٩-جێی دەستخۆشییە كە خۆری ئیسلام بوێرانە باس لەو رووداوانە دەكات كە دەرهەق بەمیللەتی ئێمە كراون بەجینۆسایدو تێكدانی گوندو خاپووركردنی مزگەوت.

١٠-دەبێت خۆری ئیسلام وریا بێت لەوەی هەندێك شتی لاوەكی هەیە لەوانەیە جارێ قۆناغی ئەزموونی كورد ئەو قۆناغە نییەو هەندێك كەس بەمەبەستی برەودان بەبیرو هزری خۆی گرنگی پێدەدات، دەبێت خۆری ئیسلام بەوریایی خۆی لەقەرەی ئەم جۆرە باسانە بدات، چونكە بەورووژاندنی ئەم باسانە نە خزمەتی دین و نەخزمەتی كوردیش ناكرێت.

لەدوماهیدا هیوای سەركەوتن و بەرەو پێش چوون بۆ خۆری ئیسلام دەخوازین، دەستخۆشیش لەدەستەی بەرێوەبردن دەكەین كە بەكارەكەیان توانیان خۆری ئیسلام بەرەو ئاستی بەرز بەرن.






## هاوسەرگیری خزمایەتی لەمێژووی کۆن و بەر لە پێغەمبەرە گەورەکانی خودا :

لەرابردوودا رووی هاوبەشی تاکەکانی خێزانێك تایبەتمەندی خوێنەکەیان بوو، بەجۆرێك بۆ خوێنی هەر خێزانیك چەند پلەیەکی تایبەتیان دانابوو کە خوێنی کەسێکی تر ئەو ئیمتیازانەی نەبووەو باوەڕیان وابوو کە ئەم تایبەتمەندیانە لەرێی میراتیەوە لەباوکەوە بۆ مندالْ دەگوازرێتەوە ئەم بیرو باوەڕە بەرادەیەك بوو کە پاشاکان خوێنی خۆیان بەبالآترو پیرۆز تر لەکەسانی دیکە دەزانی، گەلێك زاراوەی وەك خوێنی شاهانەیان بۆ خۆیان دانابوو، هاوسەر گیری لەگەلْ بێگانە بەتێك شکانی تخوب و سەنگەری تایبەتمەندێتی خوێنی خۆیان دەزانیو بەم کارەیان لەتێکەلآو بوونی خوێنی خۆیان لەقەلەم دەدا، ئەوان باوەڕیان وابوو هاوسەرگیری لەم چەشنە دەبێتە مایەی تێك شکانی سیفەتە بنەڕەتییەکەیان، لەبەرئەوە هاوسەرگیری خزمایەتیان بەهۆکاری پاراستن و مانەوەی سیفەتی خوێنی باوو باپیران دادەنا، بەم پێیە زاراوەی هاوخوێنی لەم سەردەمدا لەگەلْ هاوسەر گیری خزمایەتیدا دانرا. کۆنترین یادەوەری لەمەڕ هاوسەرگیری خزمایەتی بۆ فیرعەونەکانی میسر دەگەڕێتەوە. ئەم پاشایانە کچەکانی خۆیان بەخەلْکی سادە نەدەداو بێگانە هێنانیان بەتێکەلآو بوونی خوێن لەقەلەم دەدا. باوەڕیان وابوو پاکژی خوێنی شاهانە بەهاوسەرگیری بێگانە هێرشی دەکرێتە سەر، لەبەرئەوە تا چوار نەوە فیرعەونەکان کچان و کوڕانی خۆیان ناچار دەکرد پێکەوە هاوسەرگیری بکەن (صفاپور-٤٤-١٣٤٣).

لە(ئێران)ی کۆندا گرنگترین نیشانەی تاك بنەچەو رەگەزو نەژاد بووەو شانازی پێشینان بەخزمایەتی گەورەیی تیرەو خەلْکەکانیانەوە بووە، لەکۆمەلْگەی کۆندا بەهۆی سادەیی کۆمەلْگاوە تاك نیشانەو ناوو شۆرەتی خۆی بەدرێژایی تەمەنی لەگەردندابووە، زاراوەی رەسەنایەتی خێزان کەلەزمانی سەردەمدا باوەو بۆ هەندێك پلەو پایە دەخولْقێنێت، هەر لەسۆنگەی گرنگیدان بەخزمایەتییەوە سەرچاوە دەگرێت و بەهەمان شێوەیە گەلێك زاراوەی فۆلکلۆری وەك لەبن گژو گیا دەرنەهاتووە، باوك و دایك دار، لەسەر خوانی باوکی نانی خواردووەو.. (بهنام ١٣٥٢)

دوو هۆکاری دیکەی هاوسەرگیری خزمایەتی پلە یەك و دوو بۆ هاوسەر گرتن لەگەلْ مەحرەمەکان، لەپێش پێغەمبەرانی گەورەی خودا بریتی بوون لە:-

١. لەبەرامبەر بەشودانی کچ بەدەرەوەی خێزان باوك ناچار بوو برێك لەدارایی خۆی وەك جیازی بۆ مالْی زاوا بنێرێت، لەم رووەوە کەباوکەکان سامانێکیان کەم نەکات وایان پێ باش بوو کچەکانیان مێرد بەکوڕانی خێزانەکەی خۆیان بکەن.

٢. کۆمەلْگاکانی ئەو دەمە زۆر سنووردارو پەیوەندی نێوان گوندو شارەکان زۆر کەم بوو، بۆیە



بەگشتی تاکەکانی یەک خێزان لەگەڵ یەکتردا پەیوەندیو هەڵس و کەوتیان هەبوو.. (صفاپور ٤٤- ١٣٤٣).

**هاوسەرگیری خزم خوازی لە ئایینی یەهودیدا:**

یەکەم جار حەزرەتی موسا(د.خ) قەدەغە کردنی هاوسەرگیری کەسانی هاوخوێنی خستەڕوو هەر چەندە لەو سەردەمەدا نەتەوەی یەهود هێندە پەیڕەوی ئەم ڕێنماییانەی موسایان نەدەکردو هێشتا وەك سەردەمی کۆن بڵاوبوونەوەی هاوخوێنیو هاوسەرگیری خزمایەتی لەنێو ئەم نەتەوەدا بەزۆری بەرچاو دەکەوێت و، لەهەر شوێنێك باس لەهاوسەرگیری لەگەڵ مەحرەمدا بکرێت ئەم نەتەوەیە لەبەرچاودا بەرجەستە دەبێت، بەڵام حەزرەتی موسا(د.خ) هاوسەرگیری لەگەڵ خزمایەتی نزیکدا قەدەغە کردووە، بەگوێرەی فەرمانی راکشاوی تەورات هاوسەرگیری کارێکی پێویست و داواکراوە، بەڵام نوسراوە کە هیچ تاکێکی ئیسرائیلی مافی ئەوەی نییە مەحرەمەکانی خۆی بخوازێت، چونکە ئەم جۆرە هاوسەرگیریانە بەزینا دەدرێتە قەڵەم، راڤەیەکی جوان لەم بارەیەوە هاتووە، هەر ئەندازەیەك خوێنە بەیەك گەیشتووەکان پێکەوە نزیک بن، میوەکان واتە منداڵەکان لاوازو لەئاکام ناشیرین و لەرووی ژیریو دەرك كردنەوە كەم و كوڕ دەردەچن، بەپێچەوانەوە ئەگەر خوێنە بەیەك گەیشتووەکان خاوەن تایبەتمەندی جیاواز بن منداڵەکانیان هۆشیار دەبن، تێبینی درەختەکان بکەن، هەرگیز بینیوتانە یا بیستوتانە کە لقی درەختی سێوێك ببڕن و دووبارە لەخۆی پێوەندی بکەن، ئەڵبەتە نەخێر. گریمان موتوربەیان کرد ئایا میوەیەکی باشتر بەرهەم دێنێت. لەسەر ئەم ڕێسایە باخەوانەکان نەمامی پێوەند کردنەکەیان لەشارە دوورە دەستەکانەوە دەهێنن کە میوەکانیان بەگەورەیی‌و چاکی بەناوبانگەو بەهەمان شێوە ئەم مەسەلەیە لەچاك کردنی ئاژەڵدا رەچاو کراوە (صفاپور ٤٤- ١٣٤٣).

هەر چۆنێك بێت بەپێچەوانەی ڕێنماییەکانی حەزرەتی موسا لەم ئاینەدا هاوسەرگیری لەم چەشنە لەرووی یاساییەوە بەرێگا پێدراو دەژمێردرێت (مەولەوی ١٣٤٨) لەبەر ئەوەی مەسەلەی حەرام بوونی دایك و خوشکی شیریو خاڵ لەگەڵ خوشکەزای خۆیدا یا مام لەگەڵ برازاکانی خۆیدا لەدەقی راشکاوی تەوراتدا بوونی نییە، بۆیە یەهودییەکان بەم بۆنەیەوە مۆڵەتی هاوسەرگیریان بەخۆیان داوە لەگەڵ ئەو مەحرەمانەی سەرەوەدا (شەریفی ٤١-١٣٤٠) لەبەر ئەوەی هاوسەرگیری لەنێوان توێژە نزیکەکاندا (پلە

> لەگەڵ خزمانی نزیکدا هاوسەرگیری مەکەن لەم حاڵەتەدا منداڵەکان لاواز، ناجۆر بەپەراسوی بچووك و ناتەواوتان دەبێت
>
> یاساکانی ئیسلام بایەخێکی زۆریان بەمەسەلەی چۆنێتی هەڵبژاردنی هاوسەرو چاککردنی وەچە داوە



دوو) لەئایینی یەهودیدا بەرفراوانە هۆکاری زۆر بوونی نەخۆشییەکانی هاوخوێنی لای جولەکەکان هەمان مەسەلەیە (صفاپور ٤٤-١٣٤٣).

ئیستین (١٩٧٧) لەسەروەرییەوە (١٣٧٤) پیشانیدا نەخۆشی تی ساکس (٣٣) هێندەو گوشە (٦٦) هێندە و تورسیون دیستونیا (١٢٥) هێندە ، لەجولەکە ئەشکەنازیەکاندا زۆرترە لە جولەکەکانی تێکرای نەتەوەکانی دیکە، ئەمەش بەهۆی زۆری هاوسەرگیری پلە دوو لای ئەم تیرەیە.

## ٣-هاوسەرگیری لە ئایینی زەردەشتدا:

بەمەبەستی دەرك کردنی راستی مەسەلەی هاوسەرگیری لەئایینی زەردەشتدا دوو بۆچوون دەخرێتە روو، جۆرەکانی هاوسەرگیری لای ئێرانییە کۆنەکان (زەردەشتیەکان) ئەم حاڵەتانەی خوارەوە دەگرێتەوە:-

شاژن: هاوسەرگیری کوڕو کچێك کە بۆ یەکەمجارو بەرەزامەندی خۆیان و دایك و باوکیان دەبنە هاوسەر.

خۆ بەشودانی ژن: ژن بەخواستی خۆی، بەڵام بەبێ رەزامەندیو رێگا پێدانی باوك و دایکی شوو بەپیاوێك دەکات.

چاکر ژن (نۆکەرە ژن): ژنێك بەشێوەی هەوێ دەچێتە ماڵی مێردو گوێڕایەڵی ژنی یەکەم (شاژن) دەبێت و یا ژنێك کە دوای مردنی هاوسەرەکەی خۆی شوو بەپیاوێکی تر دەکات (عبدی نجف ابادی ١٣٧٢).

ایوك ژن: کوڕێك، کچێك کە بەتاقانە منداڵی باوك و دایکی دەژمێردرێت بەهاوسەری خۆی هەڵدەبژێرێت، ئەم دوانە لەکاتی هاوسەرگیریدا پەیمان دەدەن کەیەکێك لەکوڕەکانی خۆیان بکەنە کوڕی باوکی کچەکە، بەواتایەکی تر ئەم کوڕە بەناوی باپیریەوە ناونووس دەکرێت.

ستر ژن: ئەگەر لاوێکی پێگەیشتوو پێش لەژن هێنان بمرێت، خزمانی کوڕەکە، کچێك بەناوی لاوە کۆچ کردووەکەوە لەگەنجێکی دیکە مارە دەبڕن و ئەم کچە تێچوونی شوکردنەکەی لەدارایی کوڕە مردووەکە ئامادە دەکات، بەڵام بەو مەرجەی یەکەمین کوڕی خۆی بە کوڕی ئەو ((لاوە کۆچ کردووە)) ناوزەد بکات (عبدی نجف ابادی ١٣٧٢) ئەو مەسەلەیە لەپێناوی پاراستنی ناوی خانەوادەی پیاوە مردووەکەیە (صفاپور ٤٤-١٣٤٣).

خاڵی ٤و ٥ لەو حاڵەتانەیە کە مێژوونووسانی بەو ئاقارەدا بردووە تا بنووسن کە هاوسەرگیری براو خوشك لەئایینی زەردەشتدا قەدەغەکراو نییە، مێژوو نووسان هەروەها ئاماژە بەهاوسەرگیری ئەردەشیری دووەم و بەهرام چوبینە لەگەڵ خوشکەکانیانداو داستانی قباد دەکەن (صفاپور ٤٤-١٣٤٣).

مێژوونووسان بەپشت بەستن بەگوتەکانی (هیرۆدۆت)ی یۆنانی سەبارەت بەهاوسەرگیری کمبوجیە لەگەڵ ئاتۆسای خوشکی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەیان بەنەریتێکی نەگۆڕی ئێرانیەکان داناوە (عبدی نجف ابادی ١٣٧٢) بەگشتی قایل بووان بەم دیدگایە باوەڕیان وایە: بەگوێرەی رێنماییەکانی ئاڤێستا هاوسەرگیری براو خوشك دەبێتە مایەی بەدەست هێنانی رووناکی ئەیزەدو ئەهریمەن، دادپەروەری تایبەت بەشوێن کەوتوانی ئاهورامزدا بەشێوەیەکی بەردەوام باوەڕی وابوو کەپیاوان رێگا پێدراون بەهاوسەرگیری لەگەڵ دایك یا خوشك یا کچی خۆیاندا، بەگوێرەی ئەم بەڵگەیە رێ وشوێنی پەیوەندی ژن و مێردایەتی لای شوێن کەوتوانی زەردەشت بەگوێرەی بەڵگە مێژووییەکان هاوسەرگیری خزمایەتی هەرچەندە نزیکتر بێت پەسند تر بووە تا ئەو رادەیەی مەحرەم لەنامەحرەم جودا ناکاتەوە (عسکری ١٣٧٢).

لەبەرامبەرئەو کەمینەی سەرەوەدا، زانایانی زەردەشت باوەڕیان وایە، یەکەم هیرۆدۆت لەنێوان



سالآنی ٤٨٤-٤٢٥ هـ ق- ژیاوەو هیچ کاتێك سەردانی ئێرانی نەکردووەو ئەوەی نووسیویەتی، بیستراوەکانی ئەوە بووە، ئەمڕۆ دۆزینەوەی ئارکۆلۆژییەکان زۆرێك لەنووسراوەکانی هیرۆدۆت وەك نووسراوەکەی لەمەڕ رەفتاری خراپی کمبوجیە لەگەڵ لاشەی مۆمیا کراوی ئامازیس و بریندار بوونی گای ئامپیسی پوچەڵ کردۆتەوە، کەواتە لەخوێندنەوەی مێژووی هیرۆدۆت و قبوڵ کردنی گوتەکانی ئەودا دەبێت وریا بین.

دووەم: گریمان کە ریوایەتی ناوبراو (هاوسەرگیری کمبوجیەو ئاتۆسا) راست بێت، ناتوانرێت ئەم مەسەلەیە بەسەر تەواوی کۆمەڵگەی ئەو رۆژەی ئێراندا بسەپێنین، هاوسەرگیری لەگەڵ مەحرەمەکاندا نە لەرێ‌و رەسمی فارسەکان و نە لەئایینی زەردەشتیدا جەختی لەسەر کراوەتەوە، بەڵکو یاسایەکە دروست کراوی پادشای ئەو سەردەمە بووە (عبدی نجف ابادی ١٣٧٢).

سێهەم: ئەگەر هاوسەرگیری ئەردەشیری دووەم و بەهرام چوبینەش لەگەڵ خوشکەکانیان و داستانی قوباد راست بێت و دەبێت بڵێین ئەردەشیر لەژێر کاریگەری تەلقینی جولەکەکاندا ئەم کارەی ئەنجام داوە، قوبادیش مزدەیەکی بووەو بەهرام چوبینەش لەبنەڕەتدا هیچ ئاینزایەکی نەبووە.

چوارەم: ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ مەحرەمەکاندا لەئایینی زەردەشتیدا بێ بەربەست ببوایە دەبێت لەنێوان زەردەشتییەکانی ئەمڕۆشدا ئەو نەریتە هەبوایە، چونکە ئەوان تەواوی داب و نەریتی خۆیان بەدەست لێ نەدراوی وەك خۆی پاراستووە (صفاپور ٤٤- ١٣٤٣).

دەربارەی هاوسەرگیری لەگەڵ تێکڕای خزمانی دیکەدا پورد داوودو نفیسی (لەشریفی، ٤١-١٣٤٠) دەڵێن:

بەبڕوای هەندێك لەراڤەکاران بەگوێرەی ئایەتەکانی ئاڤێستا هاوسەرگیری لەنێوان خزم و کەس و کاردا لای زەردەشتییەکان باوبووە.

هێشتا شوێنەواری هاوسەرگیری خزمایەتی لەنێو ئێرانییە موسڵمانەکاندا ماوە، ئەمە لەپەندی پێشینانەکاندا بەروونی دیارە وەك زەماوەن لەگەڵ خۆیی‌و مامەڵە لەگەڵ بێگانە.

بەگشتی لەپۆلێن کردنی بۆچوونە تەباو دژەکانی هاوسەرگیری خزمایەتی لەئایینی زەردەشتیدا دەگەینە ئەو ئاکامە: یەکەم هاوسەرگیری خزمایەتی لەئایینی زەردەشتدا وەك داب و نەریتێکی دێرینە جێگای گومانەو ئەوەی ئێستا لەنێو زەردەشتییەکاندا باوە ئەوەیە کە هاوسەرگیری لەگەڵ مەحرەمەکاندا جێگای رەزامەندی زانایانی ئەم ئایینەیە.

دووەم/ هاوسەرگیری لەگەڵ باقی خزم و کەس و کاردا لەم ئایینەدا بەگوێرەی پەندی پێشینانەکانی مێژووی ئەدەبیاتی ئێران کەزۆرتر جەخت لەسەر بنەچەو رەگەزو نەژادو پاراستنی ناوی خانەوادەیی دەکەنەوە بۆ نموونە (ژن خواستن لەخودی‌و مامەڵە لەگەڵ بێگانە، لەبن گیا دەرنەهاتووە یا باوك و دایك دار، هەموویان نیشان دەری جەخت کردنەوەی زەردەشتییەکان لەسەر ژن و ژن خوازی پلە (٣) بەدواوەیە (مەبەست لەهاوسەرگیری پلە ٣ ، هاوسەرگیرییە لەگەڵ ئامۆزا خاڵۆزا، پورزایە).

## ٤-هاوسەرگیری خزمایەتی لەئایینی مەسیحیدا :-

لەبەرئەوەی بەر لەحەزرەتی عیسا(د.خ) کتێبەکانی تەورات و ئاڤێستا چەندین یاسایان بەدرێژی لەمەڕ مەحرەمەکان و خزم و هاوسەرگیری لەنێوان خزماندا بەیان کردبوو، بەم بەڵگەیە لەئینجیلدا دەستورێکی راشکاو نەهاتووەو مەسیحیەکان هەمان بڕیارو یاسایان کردۆتە پێو دانگی کارکردن، هێندە نەبێت بەگوێرەی باری ناوخۆیی، جوگرافی‌و کۆمەڵایەتی کەمێك گۆڕانکاریان لەدەستووری پێغەمبەرە پێشووەکاندا



کردووە، بەڵام ئۆرپۆدۆکس برِوای وایە بەهۆی نەشیاوی خوێنە لێك نزیکەکان باشتر وایە تا حەوت پشتی باوك و دایکی بووك و زاوا خزمی یەك نەبن (صفاپور ٤٤-١٣٤٣).

ئۆرپۆدۆکس بۆ ئەم مەسەلەیە پشت بەئایەتەکانی تەوراتی لاویان بەشی ٨ ئایەتی ٦ دەبەستن (شریفی ٤٢-١٣٤٢) ئەم کۆمەڵە سەرباری بۆ چوونی تەورات لەم زەمینەدا هاوسەرگیری لەگەڵ کچی مام، خاڵ، پووردا کە لەکتێبی جولەکەکاندا یاساغ نەبووە بەرەوا نازانن (صفاپور ٤٤-١٣٤٣).

## ٥- هاوسەرگیری خزمایەتی لەئایینی ئیسلامدا:

تێکرای ئایینە گەورەکان هاوسەرگیری نزیکەکان و مەحرەمەکانیان رەت کردۆتەوە، لەئایینی ئیسلامیشدا وەك سەرجەم ئایینە گەورەکان هاوسەرگیری لەگەڵ مەحرەمەکاندا رەت کردنەوەی راگەیەنراوە، یاساو سنووری هاوسەرگیری لەگەڵ مەرحەمەکاندا لەئایینی ئیسلامدا هەمان رێساو سنووری ئایینەکانی پێش ئیسلامە، سەرباری ئەوەی لە ئیسلامدا مەسەلەی خزمایەتی شیریش لەئارادایە ( صفاپور ٤٤-١٣٤٣).

پێناسەی مەحرەم لەهەر کۆمەڵگایەکدا جیاوازە. لەهەندێ کۆمەڵگەدا هاوسەرگیری ئامۆزا باوکیەکان قەدەغەیەو لەهەندێکی تردا هاوسەرگیری ئامۆزا باوکیو دایکییەکان بەرێگا پێدراو دراونەتە قەڵەم (مەولەوی ١٣٤٨). ئایینی ئیسلام لەقورئانی پیرۆزدا (سوورەتی نساء ئایەتی ٢٢-٢٣) سنووری مەحرەمەکانی دیاری کردووە بەگوێرەی ئایەتی ناوبراو مەحرەمەکان بریتین لە: ژنی باوك، دایك، کچ، خوشك، پور، کچی برا، کچی خوشك، دایك و خوشکی شیری، خەسوو، کچی هاوسەر کە لەدامێنی پیاوەکەدا گەورە بوون. ژنی کور (بووك)و

**هاوسەرگیری لەگەڵ بێگانەو دەرەوەی بازنەی خزمدا بانگەشەی بۆ کراوە کەئە نجامەکەی سیفەتی چاك وەبەردێنێ**

هاوسەرگیری لەگەڵ دوو خوشکدا لەیەك کاتدا. بەم پێیە هاوسەرگیری پلە یەك و دوو (مەبەست هاوسەرگیرییە لەگەڵ مەحرەمە نزیکەکان) قەدەغەیەو رەت کراوەیە، یاساکانی ئیسلام بایەخێکی زۆریان داوە بەمەسەلەی چۆنێتی هەڵبژاردنی هاوسەرو چاککردنی وەچە. بۆ بەرگرتن لەسەرهەڵدانی وەچەی ناتەواوو نائاسایی دەستووری فەرمانی شیاوو تێبینی خستۆتەروو.

حەزرەتی محەممەد(د.خ) دەفەرموێت: لەگەڵ خزمانی نزیکدا هاوسەرگیری مەکەن لەم حاڵەتەدا منداڵەکان لاواز، ناجۆر بەپەراسوی بچووك و ناتەواوتان دەبێت. (مەولەوی ١٣٤٨) هەروەها دەفەرموێت: هۆشیار بن تۆوی خۆتان لەهچ شوێنێکدا دادەنێن، چونکە بۆهێڵ (عرق) بەجۆرێکی نهێنی کاردەکات، ئەم فەرمودەیە سەرنجی ئێمەی بۆ لای بۆ هێڵ (ژنتیك بەواتای سەردەم)و کاریگەری نهێنی رادەکێشێت لەفەرمودەیەکی دیکەدا دەفەرموێت: بەدبەختی مرۆڤی بەدبەخت و خۆش بەختی مرۆڤی بەختەوەر لەسکی دایکدا دیاری دەکرێت، ئەم فەرموودەش گرنگی سەردەمی پێش لەدایك بوون (هۆکاری بۆماوەیی) دەگەیەنێت (سیف و هاوکاران ١٣٧٠) پێشەوا باقر دەفەرموێت: پیاوێك لەیاریدەدەرەکان لەگەڵ هاوسەرەکەیدا هاتە خزمەتی پێغەمبەرو وتی ئەی پێغەمبەر من و خێزانەکەم کوڕە مام و کچە مامین، هاوسەرەکەم ژنێکی پاك داوێنە ئەو بۆ من منداڵێکی رەش و کونە لوت یان و کراوەو موو لولی بەدونیا هێناوە، هاوشێوەی ئەم منداڵە



لەخزمان و خانەوادەی مندا نییە بۆچوونی ئێوە چییە؟ پێغەمبەر فەرمووی: لەنێو هەر مرۆڤێکدا (٩٩) بۆهێڵ هەیە کە لەپێکهاتەی مندالّدا هەموویان کار دەکەن، کاتێك تۆو لەمندالّدان جێگیر بوو ماوەیەك دەکەوێتە جم و جول هەموویان لەخوا دەخوازن تا مندالّێکی هاوشێوەی ئەوان دروست بکات، ئەم مندالّە لێك نەچووەی ئێوە لەو عرقە دوورانەیە کە لەباپیران و داپیراندا پێشینەی نییە (احدی و نبی جمالی ١٣٧١) لەفەرمودەکەدا دەتوانرێت ئەم ئاکامانەی خوارەوەی لێ هەلّبهێنجین:

١. رۆڵی هاوسەرگیری خزمایەتییەکان (کوڕی مام، کچی مام) بەدەرکەوتنی ژنتیکە دوورەکان سیفاتی دەگرن.

٢.رۆڵی بۆهێڵ (ژنتیك) وەك هۆکاری بۆماوەیی و بوونی جیناتی هاوبەش لەگەڵ پێکهاتەی لێکچوو لەهاوسەرگیری دوو خزمدا.

٣.بایەخی میراتگری سیفاتەکان لەتایبەتمەندی کەسیدا، بەم پێیە تێبینی دەکرێت کە پێغەمبەر(د.خ) ئەنجامی گرنگترین یاساکانی ژنتیك (زانستی جینات)ی هاوچەرخی بەزمانێکی شایستەی تێگەیشتنی خەڵکی ئەو سەردەمە بەیان کردووە، لەفەرموودەی ناوبراودا رەنگدانەوەی پەیوەندی هاوسەرگیرییە خزمایەتییەکان لەسیفەتە شاراوەکان، رۆڵی ژنیتیك و بۆماوەیی، ژنیتیکە هاوبەشەکان لەهاوسەرگیری خزمایەتیدا بەیان کراوە، بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین لەئیسلامدا هاوسەرگیری لەگەڵ مەحرەمەکاندا بەگوێرەی سوورەتی نساء ئایەتی (٢٢-٢٣) حوکمی زینای هەیەو لای سەرجەم گەلانی موسڵمان رێگا پێ نەدراوەو هاوسەرگیری لەگەڵ نەخۆشەکان و خزمانیشدا رەت کراوەتەوە، بەلاّم بەستنی پەیمانی هاوسەرگیری لەگەڵ بێگانەو دەرەوەی بازنەی خزمدا بانگەشەی بۆ کراوە کەئەنجامەکەی سەرهەلّدانی سیفەتی چاك و کەم بوونەوەی نەخۆشییە بۆ ماوەییەکانە (مەولەوی ١٣٤٨) بەلاّم مەخابن بەپێچەوانەوەی ئەنگێزەی ئیسلام بۆ هاوسەرگیری تا خزمی ئامارەکان وا نیشان دەدەن هاوسەرگیری خزمایەتی پلە ٣و ٤ لەگەلە موسڵمانەکاندا بلاّوە کە دەکرێت بەنیشانەی کاریگەری دەستی داگیرکەر لەتێکدانی هێزو زاڵ بوون بەسەر گەلانی موسڵمان بدرێتە قەڵەم .

**سەرچاوە:** گۆڤاری (إطلاعات علمي) ژمارە ٧ ساڵی ٢٠٠٠.

**پێرستی سەرچاوەکان:**


١-احدی، حسن، بنی جمالی، شکوه السادات. (١٣٧١) روانشناسی رشد: مفاهیم بنیادی در روانشناسی کودك. تهران، بنیاد.

٢-بهنام، جمشید، (١٣٥٢). ساخت های خانواده و خویشاوندی در ایران. تهران خوارزمی.

٣-سروری، علی اصغر (١٣٧٤). ازدواج های فامیلی و بیماریهای ژنتیکی کودکان. اصفهان: دانشگاه علوم پزشکی اصفهان و نورین سپاهان.

٤-سیف، سوسن، کدیور، پروین، کرمی نوری، رضا لطف آبادی، حسین (١٣٧٠) روان شناسی رشد (١) تهران سمت.

٥-شریفی، کاظم (٤١-١٣٤٠). بررسی آثار ازدواج های همخون از لحاظ بهداشت نسل. رساله دکتری چاپ نشده. دانشگاه علوم پزشکی اصفهان.

٦-صفاپور، ماه تابان. (٤٤-١٣٤٣). ازدواج باقوام واپرات ان در نسل. رساله دکتری چاپ نشده. دانشگاه علوم پزشکی اصفهان.

٧-عبدی نجف ابادی، محمد، (١٣٧٢. خرداد). نماز ازدواج درکیش زرتشت. سخن اهل دل. نشریه دانشگاه ازاد اسلامی واحد نجف اباد.ص١٥-٥

٨-عسکری، علی. (١٣٧٢). بررسی رابطة ازدواج خویشاوندی والدین و نارسائی های بینائی و شنوائی کودکان. پایان نامه کارشناسی ارشد چاپ نشده. دانشگاه ازاد اسلامی واحد تهران مرکزی.

٩-قران مجید.

١٠-مولوی. محمد علی. (١٣٤٨). اصول و بیماریهای ارپی (جلد اول) تهران: دانشگاه تهران.



# زیانەکانی جگەرەکێشان لەروانگەی ئیسلامەوە

د. مەقسود ئیسماعیل عومەر

دەتوانین گفتوگۆیەك لە بارەی حوكمی شەرع لە ئیسلامدا لەسەر زیانەكانی جگەرە كێشان پیشان بدەین، ئەمەش بە پیشاندانی چەند زەرەرو زیانێكی گیانی و ماڵی، هەندێك لەم زیانانە ئاشكرا و روونن كە رۆژانە دەیانبینین یان دەیانبیستین، بەڵام لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین هەندێك زانیاری دیكە دیاری بكەین كە ئاشكراو روون نین ئەویش لەمانەی خوارەوە پێك دێن:

١-زیانی تەندروستی بەباری مرۆڤ و دەوروبەری.

٢-زیان گەیاندن بەباری ئابووری مرۆڤ و كۆمەڵ.

٣-كارتێكردنی لەسەر بیرو هۆشی مرۆڤ كە دەبێتە خدووپێوە گرتن (ادمان).

٤-دورخستنەوەی مرۆڤ لەكارو بیری بەسوود.

لەبەر رۆشنایی ئەم زیانانەو چەند زیانی تریش كەكار دەكاتە سەر كۆمەڵ، لەروانگەی ئیسلامەوە ئەم زیانانەی جگەرە كێشان هیچ باسێكی ئەم كارەساتەی كە جگەرە دەیكاتە سەر خەڵك دیاری نەكردووە بەشێوەیەكی ئاشكرا و روون، بەڵام ئێمە دەزانین هیچ باسێك لەم بارەیەوە نەزانراوەو باس نەكراوە ئەمەش لەبەر ئەوەی لەكاتی پێغەمبەر(د.خ) هیچ دەقێك نییە كە باسی ئەم زەرەرو زیانانە بكات. بەڵام ئێمە دەتوانین بەحوكمی شەرع جگەرەكێشان لەرێگای پێوانەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەناڕەوا بژمێرین بەپێی فیقهی ئیسلامی، لەبەر ئەوەی كە قورئان و سوننەت و رای گشتی زانایان و پسپۆران لەبارەی شەریعەتی ئیسلام و پێوانەی چاكەكاران بەپێویستی دەزانین بۆ دان پێنانی پێوانە لەسەر جگەرە كێشان لەبنەڕەتەكە زیانەكانیشی بۆ ژیانی ئادەمیزادو بێ هۆشكەرو یان وەك (بیدعە)و زیادەڕەوی لەمەسرەف كردن بژمێردرێت و لەسەر ئەم بنەڕەتەوە هەندێك نمونە پیشان دەدەین كە حوكمی شەرعی شی كردۆتەوەو پێوانەی بۆ داناوە كە جگەرە ناڕەوایە ئەویش ئەمانەن:-

١-زیانی جگەرە كێشان بۆ ئادەمیزادو بەگۆڕانی دەوربەری‌و باری ئابووری، ئێمە دەزانین كە زیانەكانی جگەرەكێشان لەبارەی تێكدانی باری تەندروستی‌و كۆمەڵایەتی‌و ئابووری زیانێكی گەورەیەو لەبەر ئەوە خوای گەورە لەبارەی زیانی گیانی‌و ماڵی دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ/ سورة البقرة: ١٩٥﴾ هەروەها پێغەمبەر(د.خ) لەبارەی زیانی گیانی‌و ماڵی لەچەند فەرموودەیەك ئەو بنەڕەتەی لەفیقهی ئیسلامی



**زانست ئەوەی سەلماندووە کە توتن ماددەیەکی تێدایە کە نیکۆتینەو ئەمەش بەیەکێک لەماددە بێهۆشکەرەکان دادەنرێت لەبەر ئەوە بەحەرام دەژمێردرێت**

سەپاندووە دەفەرموێت: ( **لاضرر ولاضرار**).

٢-جگەرەکێشان و دووکەڵی جگەرە وەك ماددەیەکی بێ هۆشکەرن بەسەلماندنی زۆر لەزانستی نوێی پزیشکی کە ماددەی نیکۆتین لەدووکەڵی جگەرە دایەو کاردەکاتە سەر بیرو هۆشی مرۆڤ وای لێدەکات. کە خدوو پێگرتوو (مدمن) بێ ئەگەر بەژەمێکی زیاتر بەکاری بێنین وای لێدەکات کە بەجۆرێك لەسەرخۆش کردن بژمێردرێت، نمونەش زۆرە بۆ ئەوەی کە زۆر لەوانەی جگەرە دەکێشن دەڵێن ئێمە ناتوانین وازی لێ بێنین ئەگەر پێش بمرین، ئەوەی کە زۆر جگەرەکێشە کە نەخۆش دەکەون دەچێتە لای پزیشك بۆ چارەسەر کردن پزیشك پێی دەڵێ واز لەجگەرە بێنە دەڵێ بەخوا ناتوانم، ئەمەش یەکێکە لەشێوەکانی خدووگرتن بەجگەرەو هەر لەبەر ئەم هۆیەوە جگەرە دەچێتە ریزی ماددە بێهۆشکەرەکان. هەر لەم روانگەیەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر دێتەوە یادمان کە دەفەرموێت: ﴿**کل مسکر خمر وکل خمر حرام**﴾ ﴿**ما اسکره کثیرة فقلیة حرام**﴾.

هەندێك لەجگەرەکێشەکان جگەرە دەکێشن بەبیانووی ئەوەی کە حەرام نییە، چونکە ماددەی بێهۆشکەری کەمتر تێدایە، بەلاّم هەرچەندە کەمیش بێت کاریگەرییەکەی دەکەوێتە سەر بیرو هۆش، ئەمەش دەکەوێتە دەرگای حەرام لەئیسلامدا. لەوتەیەکی دایکی سەلمە (خوای لێ رازی بێ) دەفەرموێت: {**نهی رسول الله عن کل مسکر ومفتر**} کە دەفەرمونت (مفتر) وشەیەکە کە مانای ئەوە دەدات کە کاریگەری لەسەر بێهۆش بوون کەمترە، بەلاّم وەك ماددەکانی دی کە خەڵك بێهۆش دەکات کار دەکاتە سەر بیرو هۆش و مێشك و لەش بەگوێرەی ئەو نیکۆتینەی کە تیایەتی. هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێت: {**الخمر ما خامر العقل**} کەواتە هەر ماددەیەك کە دەکەوێتە ریزی بێهۆش بوون، کار لەبیرو هۆشی مرۆڤ دەکات بەماددەی بێهۆش دەژمێردرێت، لەبەر ئەوە جگەرەکێشانیش دەکەوێتە ئەم دەرگایە کە بەحەرام دەژمێردرێت.

٣-جگەرەکیشان جۆرێکە لەبیدعە (بدعە): ئێمە دەزانین کە جگەرەکێشان نەخواردن و خواردنەوەیەکی بەتامە، کە سوودی هەبێت یاخود پێویست بێت بۆ لەشی مرۆڤ. لەبەر ئەوەی لەبارەی کۆمەلاّیەتی کە لاسایی کردنەوەی بێگانەیە لەم بارەیەوە دەکەوێتە ریزی بیدعەت کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام باسی بیدعەت دەکات بە رێگایەکی ناشەرعی دەدرێتە قەلەم. لەم بارەیەوە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ {**وشر الامور محدثاتها، کل محدثة**



بدعة، كل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار}.

٤-جگەرەکێشان یەکێکە لەدیاردەی زیادەڕەوی کردن لەسەرف کردنی سەرو ماڵی خەڵك، ڕۆژانە جگەرەکێش کەمێك لەو باروبووەی کەهەیەتی دەیسووتێنێ لەڕێگای جگەرەکێشان. زۆر خەڵك هەن کە بەشەوو ڕۆژ کار دەکەن بۆ بژێوی ماڵ و منداڵیان کە ڕۆژانەیەك پەیدا بکەن، کەچی نیوەی زیاتر لەم ڕۆژانەیە بەجگەرە دەدات سەرباری ئەوەی کە ماڵ و منداڵی قوڕەی زگیان دێت لەبرسان و ئەم هەموو زیانانەی بۆ گیان و تەندروستی ماڵ و منداڵیان و کەس و کاریان هەیەو لەباتی ئەوەی کە ئەم پارەو پولە لەچاککردنی باری ئابوری سەرف بکات ئەم زیانەش دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەڕێگاکانی زیادەڕۆیی لەسەرف کردن. بۆ ئەمەش خوای گەورە لەبابەت زیادەڕۆیی لەسەرف کردن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا/ سورة الاسراء/ ٢٧﴾ هەروەها لەجێگایەکی تر دەفەرموێت: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ/ سورة الاعراف/ ٣١﴾ هەندێك خەڵك هەن پرسیار دەکەن دەڵێن: جگەرەکێشان کە ماددەی بێهۆشکەر نییە یاخود بەماددەی بێهۆشکەر ناژمێردرێت و ناتوانین حەرامی بکەین. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە ئێمە دەزانین کە لەزەمانی پێغەمبەر(د.خ) جگەرەکێشان نەزانراوە بۆ ئەوەی کە حوکمی شەرعی یەکسەری لەسەر دەرچێ، بەڵام زانست ئەوەی سەلماندووە کە توتن ماددەیەکی تێدایە کە نیکۆتینەو ئەمەش بەیەکێك لەماددە بیهۆشکەرەکان دادەنرێت لەبەر ئەوە بەحەرام دەژمێردرێت. دکتۆر محەمەد شەلتوت کە یەکێك بوو لەئیمامەکانی مزگەوتی ئەزهەر لەکاتی خۆی لەبارەی جگەرەکێشان دەڵێت: لێرەدا ئێمە دەزانین کە چەند زانیاریەك بەراپۆرت لەبارەی کاریگەری زیانەکانی توتن بۆسەر تەندروستیو گیان و ماڵ دەزانین، لەبەر ئەوە شەرع حەرامی کردووە، هەروەها لەبەر ئەوەی کە حوکمی شەرع لەئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر شێت کە حەرام بێت یاخود کورهی تێدا بێت، ڕاناوەستێ لەسەر بوونی دەقێك (نەسێك) کە تایبەت بێت بەم باسە، هەروەها دکتۆر فەرەج زەهران کە تایبەتمەندە لەبارەی فیقهی ئیسلامی دەڵێ: حوکمی شەرع لەسەر جگەرەکێشان حەرامە لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی توتنی تێدایە بەکارهێنانی توتنیش حەرامە شەرعەن بەهەر شێوەیەك بێت و، بەهچ ڕێگایەك بەکاری بێنی، یاخود بەهەر ڕێگایەك کە بیکێشیت، یا بەکاری بێنێ ئەوا لەڕووی شەرعەوە ناڕەوایە (حەرامە).

**سەرچاوە:**

وباء التدخين واضرارة على صحة الفرد والمجتمع الطبعة الاولى ١٩٨٧ (من اصدارات جمعية مكافحة السرطان العراقية- فرع الموصل).



# فەرمانی شەرع لەبارەی جگەرەکێشان

خۆری ئیسلام



وەك دەرکـەوتووە رووەکـی (توتـن) (دووکـەڵ) (تـەماکۆ) لـەکۆتایی سـەدەی دەیـەمی کۆچـی بڵاوبووەتـەوە لـەناو خـەڵکداو گـەلێ چـیرۆکی ئەفسـوناوی وەك دەرمـانی چاوەقوڵـەو تـاعون و نەخۆشی درمی ترسناکی لەسەر دروست کـراوە، کە هەندێ ماددەی چالاکیو نیکۆتینی تێدایە.

زانایـان زۆریـان گفتوگۆ لەسەر کردوەو لـەرووی شەرعەوە دروستی ونادروستی باس کراوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوباوىو تـازە پـەیدابوونی، بیروڕای زانـا گـەورەکانی لەسـەر نییـەو زۆر نەچوونـە بنـچ و بنەوانیو توێژینەوەی زانستی لەسەر نەبووە ئـەو کاتە زۆر جیاوازی پەیدا بـووە لـەنێوان زانایـاندا، هـەندێ دەڵێن حەرامەو هـەندێ دەڵێن باش نییـەو هەندێ دەڵێن دروستەو مەباحەو هەندێ راوەستاوە بێ دەربڕینی بیروڕای پەسەند لەبەر ئەوە ناتوانرێ حـەرامیو حـەڵاڵی بـەپێی رێبازەکـانی فیقـهی ئیسلامی دیاری بکەین. وا دیارە جیـاوازی نێـوان زانایان کاتێ کە توتن داهاتووەو خەڵك فێری بووەو نەتوانراوە بەهەمە دەنگ حەرام یان حەڵاڵی بکـەن لەبەر جیاوازی دەلیل نـەبوو، بـەڵکو جیـاوازی لـە (تحقيق المناط) واتە پەسەندی هۆکار بووە، چونکە زۆر هەیـە سـودو قـازانج بـۆ جگـەرە دادەنـێو زیانەکانیشی زۆر بەکەمتر، هەیە سوودی بۆ قـایل نابێ، بەڵام زیانیشی بۆ دیاری ناکات، خۆ ئەگەر زیـانێکی بـێ چـەندو چۆنیشـی هەبوایـە بێگومـان حـەرام دەکـرا. لـێرەدا پێویسـتە ئامـاژە بـەخاڵێکی زۆر گرنگ بکەین کە دیاری کردنـی زیـانی تـەن و لـەش یـان نـەبوونی لـەتوتندا کـاری زانـای شـەرع نییـە، بـەڵکو ئـەرکی پزیشـك و حـەکیم و شـارەزا لـــەداوو دەرمـــان و نەخۆشـــیو هۆکـــاری نەخۆشییەکانە. لەم بارەوە زانایـانی پزیشك رەئـی خۆیـان داوە کە توتن زیـانی هەیـە بـۆ سـییەکان و گەروو توشی شێرپەنجە دەکات و لەمێژە پزیشکان بـۆ وازهێنـان لەدوکـەڵ کـردن و جگـەرە کێشـان بانگەشەیان کردووە.

لەوانەیە هـەندێ کـەس بڵێـن کـەی رەوایـە بـەبێ دەقی شەرعی ئەم رووەکە حـەرام بکرێ. لـەوەڵامدا دەڵێین مەرج نییە شـەرع بۆ هـەموو شـتێك دەقێك دابنێ. تەنها ئەوە بەسە کە یاساو رێسـای گشتیو بنـــەمای دروســـت دابنـــێ بـــۆ ئـــەوەی هـــەموو یەکەیەکـەی بەشـەکانی لـەژێردا جێگەبکرێتـەوە. شـەرع کە خوداو پێغەمبـەر تەنـها ئـەوە دەڵێـن کـە ((شتی پیس و زیان بەخش حەرامە))و هەرچی ئەو دووشـتەی تێدابـوو حەرامـە وەك تلیـاك و مـاددە سەرخۆش و سڕکەرەکان، کە بەکۆی دەنگ حەرامە.



فـــــەرموودەی (لاضــــــرر ولاضــــرار) دەقێکـــی روون و ئاشـــکرایە کـــە خواردنـــی شوشـەو بـەردو ژار حەرامـە. کەواتـە لەبـــەر ئـــەوەی ئـــەم رووەکە زیانی هەیە، کەواتـە حەرامە ئەوە بەلگەی یەکەم.

دووەم/ زیـــانی دارایـــیو ســـامان: پێغەمبـــەر(د.خ) بـەفیڕۆدانی مـاڵ و سـامانی قەدەغە کردوە.

ســـێیەم/ خووگرتـــن و کویلەی ئەم جگەرە کێشـانە لــــەرووی نەفســـــیو دەروونییـــەوە، زۆر کـــەس لەسەر جگەرە ستەم لەماڵ و منداڵی دەکات و ئەگەر وازی هێنـــا توشـــی ئـــالۆزی دەروونیو باری ژیانی تێك دەچێت و تورەو کەللە رەق و نارەحـــەت دەبـــێ، دیـــارە ئـــەم جـــۆری بەندایەتییە هۆکـاری حەرامییـە. چونکـە جگـەرە قووت نییە هەتا مانەوەی ژیانی لەسەر بەندبێت.

کەواتە حەڵاڵ بوونی ئەو دووکەڵە پاش ئەوەی کـە زیانـــەکانی گشـــتیو تایبـــەتی گوتوەتـــەوەو دەزگاکانی پزیشـکی باسـی لـەزیان و دەرئەنجامـە خراپەکانی دەکەن و بێگومان کە حـەڵاڵیو مەباحی نەما چار نییە دەبـێ بلێین بـاش نییـەو بـێزراوەو حەرام و قەدەغەیە، کەواتە بۆ چوونی حـەرامی زۆر نزیکـە لەراســـتییەوە، لەلایـــەکی تـــرەوە ئـــەو پێویستیانەی کـە زانایـانی ئوسـول دەڵێن واجبە پارێزگاری لێ بکریو نـابێ زیانیـان پـێ بگـات کـە ئاین و گیان وژیریو وەچەو سامانە هەموویان لەم بەلایە زیان دەبینن زۆر کـەس هەیە ناتوانی رۆژوو بگرێ لەبەر جگەرەکێشـان. ساوا زیانی پێدەگات پێش بوونـــی لـــەدایك و پـــاش بوونیو سوتاندنی سامانەو لابردنـــی ژیریـــیو فامـــە، کەواتـــە بۆچـــی قەدەغـــە نـەبێت. تەنها گومـانێك کـە ئەوانــــەی ئـــــالودەبوون بەجگـــــەرەوە دەســـــتی پێوەبگـرن گوایـە قـازانجی جوتیـاری هەیـە، چونکـە لەبەرهەمەکـــەی ســـوود وەردەگـــرن و کـــاری تێـــدا دەکـــات و دەیـــان هـــەزار کاســـــب و کارمـــــەندو ردەفرۆش سودو قازانجی لێ دەکـەن.. تـــاد. بـەلام ئـەم بۆچوونـە هەڵەیـە چونکـە مەیو گۆشتی بـەرازو شتە حەرامەکانیش زیانی بێ چەندو چۆنی نییە، بەڵکو هەندێ قـازانج و چاکـەی هەیـە ((اثـمهما اکبر مـن نفعهما)) دەقی قورئانە بۆ قومارو شـەراب بێگومـان حـــەرامی ئـــەم دووانـــە بـــەقورئان و فـــەرموودەو هەمەدەنگی حەرامە.

> ((شتی پیس و زیان بەخش حەرامە)) و هەرچی ئەو دوو شتەی تێدا بوو حەرامە
>
> بۆچی قەدەغە نەبێت. تەنها گومانێك کە ئەوانەی ئالودەبوون بەجگەرە وە دەستی پێوەبگرن گوایە قازانجی جوتیاری هەیە

لەبـەر ئـەوە زۆر پێویسـتە ئەگـەر بەتـەواویش قەدەغـە نـەکرێ پێویسـتە لەمزگـەوت و شـوێنە گشتیو ناو خەڵك و ناو پاسەکان و کارگەو دەزگاو دائرەکان بەئاشکرا قەدەغە بکرێ.

رێـزی ئەوانـەش بگیرێ کـە جگــەرە ناکێشـن و بەحەرامی دەزانن. زیانی جگەرە ئەوەندەی زیـانی بۆ جگەرە کێش هەیە دوو هێندەش بۆ دانیشتوانی ئەو شوێنە کە جگەرەی تێدا دەکێشریو ژینگـەش پۆخڵ و گەندەڵ و ژەهراوی دەکات.



بێگومان سەرچاوە ئیسلامییەکان کاریگەرییەکی زۆریان کردۆتە سەر گێتی لە هەموو ڕەهەندەکانی سۆسیۆلۆژیاو ئەبستمۆلۆژیاو سایکۆلۆژیاو پۆلەتیکاو.. هتد، هەڵبەت ئەورووپاش لەم کاریگەرییەدا بێبەش نەبووە، چونکە بەشێك لەجەستەی ئەورووپاش کەوتە ژێر ڕکێفی موسلمانانەوە، جا لەبواری ئەدەبیشدا دەبینین شاعیران و چیرۆکنووسان و ڕۆماننووسان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری سەرچاوە ئیسلامییەکان، ئەم کاریگەرییە گشگیرییەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە پرۆگرامی ئیسلام پرۆگرامێکی جیهانییە، هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ- سورة الانبياء/١٠٧﴾ ئەوەتە شاعیری ئیتالی (دانتی) لە(کۆمیدیای خوداوەندی)دا سوودێکی تەواوی لەڕووداوی (ئیسراو میعراج)ەوە وەرگرتووە، دیارە ئەو کاریگەریەش لەلای (دانتی) لەسۆنگەی (رسالة الغفران)ی (ئەبو عەلای مەعەری) بووە. هەروەسا شاعیرو شانۆنامە نووسی ئەڵمانی (گۆتە) زۆر کاریگەر بووە بەقورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ)،




لێرەوە دەمەوێت رایەڵە هاوبەشەکانی نێوان ڕۆمانی (چارەنووس)ی نوسەری فەرەنسی (ڤۆڵتێر)و چیرۆکی حەزرەتی موسا -دروودی لێ بێ- و بەندە سالحەکە -کە لەسورەتی (کەهف) باس کراوە- بخەمە ڕوو:-

سەرەتا بلەز ڕووداوەکان لەهەردوو دەقەکە دەخەینە ڕوو، وێجا بەراوردیان دەکەین و رایەڵە هاوبەشەکان دەست نیشان دەکەین. هەردوو دەقەکە لەوێوە دەست پێ دەکەن کەوا کەسایەتیە گەنجەکان (زادیج و حەزرەتی موسا- دروودی لێبێ) بەوێڵیو سەرگەردانی ملی ڕێگا دەگرن و توشی دوو (پیاوچاك) دەبن -واتە هەریەکەیان تووشی پیاوچاکێك دەبێ- ئیدی لێرەوە ڕووداو گەلێکی سەراسیمەو سەرسووڕهێنەر دەبینین.

## سێ ڕووداوەکەی ڕۆمانی

## ( چارەنووس )

١-(زادیج و پیاوچاکەکە) دەڕۆن دەچنە کۆشکێکی گەورەو جوان و پاك و تەمیز، دوای ئەوەی لەلایەن خودان کۆشکەکەو نۆکەرەکانەوە پێشوازییەکی زۆر باشیان لێ دەکرێت و نانێکی شاهانە دەخۆن و دەستیان لەناو دەست شۆرێکی زێڕدا دەشۆن، کە دەڕۆن خودان کۆشکەکە سەرو لیرەشیان دەداتێ، بەڵام پیاوچاکەکە دەست شۆرە زێڕەکە دەدزێت، دواتر دەچنە ناو خانووچکەیەکی زۆر پیس و پۆخڵ و خودان ماڵەکە تابڵێی بەخیل و ڕژدو چروکەو دەیانباتە نێو تەویلەی وڵاخان و هەندێك زەیتوونی بۆگەنیان بۆ دێنێ لەگەڵ نانە ڕەقێکی پۆخڵ و دۆیەکی ترش.. بەکورتی زۆر بەخراپی پێشوازیان کردن، دوای ئەوەی ویستیان بڕۆن پیاوچاکەکە چووە لای خانەخوێکەو پێی گوت: ((فەرموو لەبریتی پاداشتی ئەو ماندووبوون و خزمەتکردنە من ئەو دەستشۆرە زێڕەت پێشکەش



دەکــــەم)) {چـــارەنووس، ل ١٩٨}. هەروەســـا ئـــەو دوو لیرەیـەی کـە وەریـانگرتبوو دای بەنۆکەرێکی پیر. (زادیج) ئارامی نـامێنێ و دێتـە قسـە، بـەڵام (پیاوچاکەکە) بیری دەهێنێتـەوە کە پەیمانی داوە قسە نـەکات و ئارام بگرێت.

٢-(زادیــج و پیاوچاکەکــە) لەگەشـتەکەیاندا دەچنـە مـاڵی فەیلەسـوفێك، شـەو لــەلای دەمێننــەوە، بـەیانی زوو پیـاو چاکەکــــە ئـــاگر لــــەماڵی فەیلەســــووفەکە بـــەردەدا، دیســانەوە (زادیـــج) ئـــارامی نـامێنێت و دێتـە قسـە، بـەڵام (پیاوچاکەکە) هـزری دێنێتـەوە کە پەیمانی داوە قسە نـەکات و ئارام بگرێت.

٣-ئـەمجارەیان دەچنـە مـاڵی پـــیرەژنێك کــە مێردمنــاڵێکی لەگەڵدایە، دوای کەمێك دانیشتن دواتــر دەڕۆن و مێردمنداڵەکـــە لەگـەڵیان دەچێـت بـۆ ئـەوەی شـوێنەکەیان نیشان بدات -ئـەو شوێنەی کە بۆی دەچن- لەرێگە لەسەر پردێك گەنجەکە فرێدەداتە نێــو ئـــاوەوە.. منداڵەکـــە دەخنکێت. (زادیج) ئارامی لێبڕاو ئۆقرەی نەماو سەرزەنشتی کرد بەوەی کە کاری ناڕەوا دەکات.. ئیـــتر لــــێرەوە (زادیــــج و پیاوچاکەکــە) جیـا دەبنـــەوە.

چونکــە پیاوچاکەکــە بــۆی دەرکەوت کـە (زادیـج) نـاتوانێت بەرامبـەر ئـەو ڕووداوانـە ئـارام بگرێـــت و بێدەنگـــی خـــۆی بپـارێزێت. بـۆ ڕوون کردنـەوەی سـێ ڕووداوەکـەش پێـی گـوت: خــــودان کۆشــــکەکە هــــەموو ماندووبوونەکەی بۆ ئەوە بوو کە دەوڵەمەندی خۆی پێشانی خەڵك بـدات و کارەکەشـی تەنـها بـۆ ڕیابازی بوو، جـا لەمەوبـەر ئـەو پیــاوە دەبێتــە پیـــاوێکی هۆشمــــــەندو دووربـــــین، بەخیلەکـەش دەبێتـە خـاوەن میوانخانەیەکی ئەوتۆ کە هەرگیز هاوشـانی نـەبێ لـەریزگرتن و خزمـەتکردندا، هـەروەها ئـەو خـانووەی کـە هـێزی خوایـی تـەختی کـرد گەنجینەیـەکی گــــەورەی لــــەژێر دایــــە، فەیلەسـووفەکە هـەر ئێسـتا بـۆ خـۆی دەریدەهێنـێ. دەربـارەی ئـەو مێردمنداڵـەش کـە هـێزی پـەروەردگاری کوشـتی ئەگــەر بمابایـە لـە دوای سـاڵێکی تـر پورەکـەی خـۆی دەکوشــت و لەپاش دوو ساڵی دیکەش تۆی دەکوشت.

## سێ ڕووداوەکەی سورەتی کەهف

لەبــەر ئــەوەی ئــەو ســـێ ڕووداوەی سوڕەتی (کـەهف) زۆر

**لەبواری ئەدەبیشدا دەبینین شاعیران و چیرۆکنووسان و ڕۆماننووسان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری سەرچاوە ئیسلامییەکان**



**شاعیرو شانۆنامە نووسی ئەڵمانی (گۆتە) زۆر کاریگەر بووە بەقورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ)**

واریدن، بۆیە بلەز دەیانخەینە ڕوو، وەك بیر هێنانەوەیەك:-

١-موسا پێغەمبەرو پیاو چاکەکە -کە هەندێك پێیان وایە ئەو پیاوچاکە (خدری زیندە)یە- بەیەکەوە دەڕۆن، تووشی سەفینەیەك دەبن، چونکە پیاوچاکەکەیان ناسی بەخۆڕایی سواریان کردن، لەرێگە پیاوچاکەکە سەفینەکە کون دەکات. (موسا) ئۆقرەی نامێنێ‌و دێتە قسە، بەلام پیاوچاکەکە پێی دەڵێ تۆ توانای بەرگری کردنی ڕووداو گەلێکی سەراسیمەت نییە، ئەی پێم نەوتی: تۆ ناتوانی ئارام بگری، هەر چۆنێك بێت (موسا- درروودی لێبێ) خۆی کڕ دەکات و بەرێدەکەونەوە.

٢-ئەمجارەیان دەگەنە منداڵێك و پیاوچاکەکە دەیکوژێت، (موسا) ئۆقرەی نامێنێ لەحەژمەتان دیسان دێتە قسەو رەخنە لەپیاوچاکەکە دەگرێت، بەلام پیاوچاکەکە بەبیری دەهێنێتەوە کەوا پەیمانی داوە تەنها لەگەڵیدا بێت و قسە نەکات و سەبر بگرێت، (موساش)پێی دەڵێت: ئەگەر ئەم جارەیان وام کرد ئەوە چیتر هاوڕێیەتیم مەکە.

٣-ئەمجارەیان دەچنە گوندێك و کەس خواردن و خواردنەوەیان نادات‌و زۆر خراپ پێشوازیان لێ دەکەن، دەگەنە دیوارێك کە خەریکە دەڕووخێ، پیاوچاکەکە دیوارەکە چاك دەکاتەوە، موسا پێغەمبەر ئۆقرەی نامێنێ‌و سەرزەنشتی پیاوچاکەکە دەکات بەوەی کاری نارەوا دەکات، پیاوچاکەکە پێی دەڵێ: ئەوە کاتی جیابوونەوەی من و تۆیە، ئێستاش هەر سێ ڕووداوەکەت بۆ روون دەکەمەوە: دەربارەی کونکردنی سەفینەکە مەلیکێك هەبوو سەفینە باشەکانی بۆ خۆی دەبرد، بۆیە منیش کونم کرد تاکو سەفینەکە لەم هەژارانە زەوت نەکات. دەربارەی کوشتنی منداڵەکەش، ئەو منداڵەی کە کوشتم لەداهاتوودا دەبووە بێباوەڕو ترسی ئەوەشی لێدەکرا دایك و باوکیشی بکات بەبێبڕوا. هەرچی چاککردنەوەی دیوارەکەشە، دیوارەکە هی دوو کوڕی یەتیم بوون، لەژێر دیوارەکەدا گەنجینەیەك هەبوون کەهی ئەو دووانە بوو، باوکیان ساڵح بوو، جا خودا ویستی ئەو دوو کوڕە گەورە بن و بگەنە هێزو تین و ژیری خۆیان بەتەواوی و دواتریش گەنجینەکەیان دەربهێنن لەژێر دیوارەکەدا.

ئەمە زۆر بەکورتی پوختەی هەر سێ ڕووداوی دەقە فەرەنسییەکەو دەقە قورئانییەکە بوو، ئێستاش رایەڵە هاوبەشەکە دەخەینە ڕوو.

## رایەڵە هاوبەشەکانی هەردوو دەق:

وەك دەبنین لێکچوون و هاوشێوەییەکی تەواوو گشتی لەنێوان سەرجەم رەهەندەکانی هەردوو دەقەکە لەرووی پرەنسیپەکانی رەنگرێژبوونی دەقەکەکاندا هەیە لە(کەسایەتیەکان، شوێن، ڕووداو، مەغزا.. هتد).

هەروەسا هەردوو دەقەکە بابەتی گرنگ تیایاندا (قەدەر)و نەمانی سەبرو ئارامییان لەبەرامبەر ڕووداو گەلێکی سەراسیمەو سەر سووڕهێنەردا کە مرۆڤ لەبەرامبەریدا ئۆقرەیان



> رۆمانی (چارەنووس) دەقێکی سوود وەرگرەو
> دەقە قورئانییەکەش دەقێکی سوود
> لێوەرگیراوە، ئەمەش پێویست بە
> بەڵگەهێنانەوەی زیاتر ناکات

نامێنێ‌و حاڵەتی خامۆشی لەدەست دەدەن و گۆمی مەنگی بێدەنگی دەشڵەقێنن.

ئێستاش ئەو لایەنانە ئاشکرا دەکەین کە هاوبەشن یان لەیەکتر دەچن:

١-رووداو: هەردوو دەقەکە لەوێوە دەست پێدەکەن کە پاڵەوانەکان یاخود کەسایەتییە گەنجەکان (زادیج و موسا پێغەمبەر) دەکەونە رێ بۆ بینینی موغامەرەو رووداوی سەراسیمەی وا کە لە رواڵەتدا نارەواو دزێوو قێزەونن، بەڵام لەناوەرۆکدا رەواو قەشەنگ و تەژی لەماناو حیکمەتن.

لەهەردوو دەقەکەدا سێ رووداو هەن کە هەر هەموویان یەك مەغزاو گوتاریان لەهەناوی خۆیاندا هەڵگرتووەو لەنێو پانتایی دەقەکاندا مەڵاسدراوەو مایەی پەندو حیکمەت و عیبرەتن بۆ مرۆڤگەل، بۆ نموونە، کوشتنی منداڵ و دیتنەوەی خەزێنە لە بن دارو پەردووی خانووەکانداو پێشوازی کردنی خراپ. ئەمانە لێکچوونێکی تەواویان لەنێوانیاندا هەیە.

٢-کەسایەتی: لەهەردوو دەقەکەدا چوار کەسایەتی تەوەرەیی مەوجوودن دوانیان گەنجن و دوانیان پیر، لەهەر دەقێکیشدا گەنج و پیرێك رووداوە سەراسیمەکان ئەدا دەکەن، کەسایەتییە گەنجەکان (موسا پێغەمبەرو زادیج)ی لاون و زیرەك و هۆشیارو داناو زانان، هەردووکیشیان دەخوازن پەندو زانیاری‌و حیکمەتی زیاتری قەدەر شارەزابن، ئەویش لەدوو پیاوچاکەکە کە هەردووکیان پیرن و خودان زانستێکی زۆرن لەبواری میتافیزیکیاو حیکمەتەکانی قەدەر، ئەو دوو پیاوچاکە لەهەردوو دەقەکەدا رووداوگەلێکی سەراسیمە بەدوو لاوەکە نیشان دەدەن، ئەوەی کەمێك ئەو دوو کەسایەتییە لەیەکتر دوور دەکاتەوە ئەوەیە کە (موسا دروودی لێبێ) پێغەمبەرە (زادیج) پێغەمبەر نییە، بەڵام رەنگە لەوەدا لێك نزیك ببنەوە گەر گووتمان هەردووکیان کەسایەتییەکی (کاریزمییان) هەیە، چونکە خەسڵەتی کەسایەتی کاریزمی ویستنی ئاسوودەگی‌و کامەرانییە بۆ مرۆڤگەل.

لەرووی سایکۆلۆژیەوەش هەردوو کەسایەتییە لاوەکە (زادیج و موسا پێغەمبەر) لەحاڵەتێکی شپرزەیی‌و دوو دڵی‌و دڵەراوکێ‌و نیگەرانیدا دەژین، ئەمەش لەسۆنگەی بینینی رووداوگەلێکی سەراسیمە کەوا دڵۆپێك ئارام و سەبر لەنێو دڵ و دەروونی لاوەکاندا ناهێڵێتەوە، ئەمەش لێرەدا سەر هەڵدەدات کە خەسڵەتی پێغەمبەران -بگرە پیاوچاکانیش- ئەوەیە کە دەبێت بەرەنگاری کارە نارەواکان ببنەوە، لەخەتای ئەمەوە ئارامییان نەماوە هاتوونەتە قسە.

ئەو چوار کەسایەتییەی کە خستمانە روو لەهەردوو دەقەکەدا وەکو کەسایەتی تەوەرەیی دەبینرێن و لەتەمەن و لەرووی مەعریفی‌و ئایینی‌و سایکۆلۆژییەوە هاوشێوە



بوونێکی گشتی لەنێوانیاندا بەدی دەکرێت.

٣-مەغزا: هەردوو دەقەکە خودان یەك گوتارو مەغزان لەهەمبەر (قەدەر)دا، ئەویش ئەوەیە کەوا زیرەکیو دانایی مرۆڤ هیچ کاتێك ناتوانێت سەد دەر سەد رووداوە بینراوەکان راڤەو شیتەڵ بکات، بەڵکو لەپشت ئەو رووداوە بینراوانە مانا گەلێکی زۆر هەن کە مرۆڤ بەو زانستە کەمەی کە پێی دراوە توانستی ئەوەی نییە پەی پێیان بەرێت، هەروەسا مرۆڤ نازانێت کامەرانیو ئاسودەگیو قازانج لەچ شتێکی باش یان خراپ دایەو غەیبران نییە.

مرۆڤ نابێت بەزانست و زانیاری مەغروور بێت و خۆی پێ لە هەموو کەس زاناتر بێت، ئیمامی (بوخاری) دەگێڕێتەوە دەڵی: ئوبەی کوڕی کەعب -خوا لێی رازی بێت- فەرمووی: لەپێغەمبەرم بیست (د.خ) فەرمووی: موسا پێغەمبەر(درودی لەسەر بێ) جارێك خوتبەی دەدا بۆ بەنی ئیسرائیلیەکان، پرسیاری لێکرا زاناترین مرۆڤی ئەمرۆ کێیە؟ لەبەرسڤدا فەرمووی (من) ئینجا خوا عیتابی لێگرت، چونکە نەیفەرموو بوو خوا ئەزانێ (الله اعلم)، ئینجا خوا سروشی (وحی) کردە لای کە بەندەیەکم هەیە لەشوێنێکا کە دوو دەریا یەکانگیر دەبن، ئەو بەندەیەم لە تۆ زاناترە، ئینجا موساش عەرزی کرد چۆن ئەو بەندەیەم دەست دەکەوێت؟ خوا پێی فەرموو: ماسییەکی برژاو بخەرە ناو زەمبیلەیەکەوە لەهەر شوێنێ لێت کەوت ئەو بەندەیە لەوێیە.

ئیتر موسا پێغەمبەر دەچێتە ئەو شوێنەو بەندەکەی چاو پێدەکەوێت و داوا سەرسوورهێنەرەکان روودەدەن. ئاشکرایە لەرووی مێژووییەوە دەقە قورئانییەکە زۆر لەدەقی رۆمانی (چارەنووس) کۆنترە، هەر لەم پلاتفۆرمەوە دەتوانین بڵێین: ڤۆلتێر سوودی لەدەقە قورئانییەکە بینیووەو لەناو رۆمانەکەیدا بەرجەستەی کردووە، بەڵام بەجیاوازییەکی زۆر زۆر کەم، راستی ئەو قسەیەشمان زیاتر بۆ دەردەکەوێت ئەگەر بزانین کە ڤۆلتێر بیرو بۆچوونێکی جیهانگەرایانەی دەربارەی عەقیدە هەیە، لای ڤۆلتێر بۆ چوونەکان گشتین و خۆی نابەستێتەوە بەیەك عەقیدە یان ئایدۆلۆژیا، بەڵکو تەراتێن لەنێو سەرجەم عەقیدەو ئایدەلۆژیاکاندا دەکات، هەر لەسۆنگەی ئەمەوە کە دەربارەی بیرو باوەڕی ئایینی زۆر سەربەست بووە دوایی ئەوەی کە لەساڵی (١٧٧٨ز) لە(پاریس) کۆچی دوایی کرد، پیاوە ئایینییەکان نەیان هێشت لەگۆڕستانی مەسیحیەکاندا بنێژرێت.

کەواتە رۆمانی (چارەنووس) دەقێکی سوود وەرگرەو دەقە قورئانییەکەش دەقێکی سوود لێوەرگیراوە، ئەمەش پێویست بە بەڵگەهێنانەوەی زیاتر ناکات.

* بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بارەوە بڕوانە: گۆڤاری خۆری ئیسلام، ژمارە ٣، ئاشنایەتی گۆتە لەگەڵ ئەدەبی خۆرهەلات و قورئانی پیرۆز، نووسینی سەباح مەجید.

## سەرچاوەکان

١-قورئانی پیرۆز.

٢-صحیح البخاری.

٣-تەفسیری قورئانی پیرۆز، عوسمان عەبدولعەزیز.

٤-رێنسانس، کەمال مەزهەر، وەرگێڕانی: فوئاد مەجید میسری.

٥-رۆمانی (چارەنووس)، ڤۆلتێر، وەرگێڕانی: صابر گردعازەبانی.



# کەڵەشاخ گرتن لەنێوان ئیسلام و زانستدا

ئامادەکردنی: هێمن خۆشناو

ئایینی پیرۆزی ئیسلام و مێژووەکەی، دەریایەکی زانست و زانیارییە بۆ ژیان. (گشتگیرو هەمەلایەن) بەشێوەیەك کە هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتۆتەوە. یەکێك لەو لایەنانە لایەنی نوژداریو پزیشکییە کە بۆ ئەوکات شتێکی تازەو داهێنراوبوو. بەتایبەت دوای سەدەی زێرینی ئیسلام نوژدارو زانای ئیسلامی وا هاتنە کایەوە کە مەشخەڵی شۆڕشێکی زانست و زانیاری بوون. تائێستاش سەرچاوەیەکی گەورەی زانایانی رۆژئاواو رۆژهەڵاتن و جیهانی مۆدێرنیزم خۆی بەقەرزاری ئەو شۆڕشە دەزانێ. ئەمەش خۆی لەخۆیدا مایەی سەربەرزی موسڵمانانەو بۆ ئێمە جێگای سوپاس و ستایشی خوایە.

وەنەبێ ئامادەکردنی ئەم بابەتە، واتای ئەوە بگەیەنێت کە کردارو ئامێری کەڵەشاخ، جێگای ئامێرە پێشکەوتووەکانی تایبەت بەم کارە دەگرێتەوە، (چونکە ئێستا ئامێری سەرکەوتوو هاتۆتە کایەوەو، مەرج نییە تەنیا کەڵەشاخ گرتن ئامێری بەکارهێنەر بێت) بەڵکو تەنیا ئاماژەیەکە بەفەرموودە (گۆتەو کردارییەکانی) پێغەمبەر(د.خ)و، بۆچوونی زانستی دەربارەی کەڵەشاخ گرتن و، بیرهێنانەوەیەکی گەلی کوردمان سەبارەت بەگرنگی کەڵەشاخ و بەکارهێنانی بۆ خوێن گرتن.

پێش ئەوەی دەست بەباسی (کەڵەشاخ گرتن Cupping) بکەین، پێویستە سەرێك لەخوێنی ئادەمیزاد (ئاوی ژیان) بدەین و بزانین خوای پەروەردگار چی لەناو ئەو خوێنە دروست کردووە. کاتێك کەشتی زانست دەجوڵێنین بۆ ناو دەریای خوێن، دەبینین لەهەموو سەنگەرەکانەوە گەمارۆ دەدرێ لەلایەن خرۆکە سپییەکانی خوێن کە بەبەرگری یەکەم دادەنرێت لە لەشی مرۆڤ، چونکە دەبێتە هۆی گەمارۆدانی ئەو میکرۆبانەی کە تووشی لەشی مرۆڤ دێن. ژمارەیان لەخوێن دەگاتە (٦٠٠٠-١٠٠٠٠) لەهەر ملم٣. بەڵام ئەگەر هەر میکرۆبێك هاتە ناو لەش، ئەوا ژمارەیان (٥٠-



٦٠) جـــار بەرزدەبێتـــەوەو جێگـای باسـە خڕۆکـەی سـپی (Leukocytes) ناوکیـــان تێـــدا نییە.

پـاش ئـــەوەی کـە کەشـتی زانستمان بەگەڕ خست، وەنەبێ بـۆ داگیرکردن و راوکـردن بـێ، بەڵکو تا زیاتر جوانی دروست کراوەکانی خوای گـەورە لـەناو خوێن ئاشکرا بێت.

گەشـتێك بـەناو دەریایـەکی قەبارە (٥) لتر خوێن بکەین، کە جگە لەهـەندێك خڕۆکـەی سـپی (٢٥) بلیـۆن خڕۆکــەی سـوور (Erythrocytes) لـــەو قـــەبارە خوێنـە هەیـە. وە چونکـە ئـەم خڕۆکــە ســوورانە ناوکیـــان تێدانییـــەو تیرەیـــان نزیکـــەی (٧/٧) مایکرۆنـــە "مـــایکرۆن یەکـەی پێوانـەی (١):١٠٠٠ لـە یەك ملیمەتر". هەروەها تێکرای مـــاوەی ژیانیـــان (١٢٠) رۆژە، لەبەر ئەوەی دەمرن و خڕۆکەی نوێیـان دێنـە جـێ کـە مۆخـی ئێسـك دروسـتیان دەکـات. ژمارەشــیان لـــەخوێن (٤-٥) ملیۆنـــە لەهـــەر ملیمـــەتر ســـێجایەکدا. فـــەرمان و ئیشەکەی گەیاندنی خۆراکە بۆ لـــەش، هـــەروەها گـــەیاندنی ئۆکسجین بـۆ خانـەکانی لـەش

بەبەردەوامی بێئەوەی تووشـی مـــاندووبوون بێـــت. ئەمـــەش بەهۆی یاسا جوان و رێگـەکانی پەروەردگار.

ســـایتۆپلازمی خڕۆکـــە سـوورەکان بۆیەیـەکی تایبـەتی تێدایـە، ئـەویش هیمۆگلۆبـینە (Hemoglobin) کـــە لەئاســن و پرۆتـین و چـەوری پێکدێـت. فرمـانی هیمۆگلۆبـین گازەکـانی هەناسەدان (ئۆکسجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن) هەڵدەگرێت.

لەهـەر (١٠٠سـم٣) لـە خوێـن نزیکەی (١٥)گرام لەهیمۆگلۆبین هەیـە. کـەم بوونـی ئـەو بـڕە دەبێتـە هۆی کـەم بوونـی خوێـن (کـــەم خوێنـــی Anemia). لەلایـەکی تـر لـەناو خوێنـدا پـــەڕەکانی خوێـــن (Blood platelet) هـــەن کــە دەورێکـــی گرنگی هەیە لەمەیاندنی خوێن. تیرەیان (٢-٤) مـایکرۆ مـەترەو ناوکیـــان نییـــە، لەبـــەر ئـــەوە تێکـڕای مـاوەی ژیانیـان (١٠) رۆژەو ژمارەشیان لەمیللیمـەتر سـێجایەکی خوێنـی مرۆڤـدا نزیکەی (٢٠٠,٠٠٠) پەڕەکەیە.

لەهەندێك کاتدا تووش بوون بەهـــەندێك نەخۆشـــی دەبێتـــە هـۆی تێکشــکاندنی پـەڕەکانی خوێـــن و خوێـــن مـــەیاندن

روونادات (چونکە دەبێتە هۆی کەم بوونی ڤیتامین k).

ئەنجامی هەموو ئەو کارانـەی کـە خوێـن پێـی هەڵدەسـتێت پێویســـتی بـــەپاڵاوتن و پاککردنـەوە هەیـە.. خـــوای گـەورە نیعمـەتێکی گـەورەی بـە مـــرۆڤ بەخشـــیوە ئـــەویش دروست کردنی ئامێرێکە بۆ ئەم کارە کە لە هەر رۆژێکدا توانای پـاڵاوتنی (١٨٠) لـتر لـەخوێنی هەیـــە. بـــەهۆی (نیفرۆنـــات Nephrons) کـــە لەگورچیلـــەدا هەیە. لەدوا وێستگەی گەشـتە کورتەکەمان بۆ ناو (ئاوی ژیان) لەلای دڵ دەوەستین.

دڵ، ترومپایەکە لەئەندامێکی ماســولکەیی پێکــهاتووە کـــە کێشـــەکەی (٣١٥) گرامـــە بەنزیکـەیی. پاڵنـەری (٢٢٠٠) گـاڵۆن خوێنـە لەهـەر رۆژێکـدا، لەچوار بەش پێکهاتووە، بەشـی لای راسـت خوێـن پـاڵدەنێ بـۆ سییەکان بۆ زیـادکردنی گـازی ئۆکسجین و لێکردنـەوە گـازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن. بەڵام بەشـــی لای چـــەپ لـــەدڵ، فرمانەکـەی پاڵنـەری خوێنـە بـۆ هـەموو لـەش بـۆ زیـاد کردنـی ئۆکسجین لەشـانەکانی لـەش و هـــەڵگرتنی دووەم ئۆکســـیدی



کـاربۆن بـۆ دوو سییەکان، بـۆ ئـەوەی فـڕێ بدرێتـە دەرەوەی لـەش لەرێگـەی هەناسەدانەوە.

یـەکێك لـەنزاو پاڕانـەوەکانی پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو:-

{اللـهم یـامقلب القلـوب ثبـت قلوبنـا علـی طـاعتك} رواه الـترمذي عـن ام سـلمة. پـاش گەشـتەکەمان لـەناو خوێـن، دەگەڕێینـەوەو چـەند فەرموودەیـەکی پـیرۆزی پێغەمبـەر(د.خ) دەربـارەی کەڵەشـاخ گرتـن (الحجامـة) دەهێنینـەوە یادمـان. عـن ابـن عباس(رض الله عنهما) قال، قال رسـول الله(ص) {الشـفاء في ثـلاث: شـربة عسـل، وشـرطة محجـم، وکیـة نـار، وانـا انـهی امـتي عـن الکـي}[1] لـە فەرموودەیـەکی تـر دەفـەرموێ: کـە هـەر (ابـن عبـاس) گێڕاویەتیـەوە (أن النـبي(ص) {احتجـم واعطـی الحجـام اجره}[2].

ئەنـەس دەگێڕێتـەوە(ر.ض) (ان رسـول الله(ص) حجمـه ابـو طیبة فأمر له بصاعین من طعام، وکلـم موالیـه فخففـوا عنـه مـن ضریبتـه وقال: خیر مـاتداویتم به الحجامة)[3].

پـاش ئـەوەی کـە زانیمـان خوێن چی تیایەو خوای گەورە چـی بـۆ دروسـت کـردووەو گرنگی خوێنمان بۆ دەرکەوت.. هەڵبـەت لـەکاتی کزبوونـی هـەر ئامێرێك یـان خرۆکەیەك مرۆڤ تووشـی نەخۆشـی دەبێـت، یـاخود هـەندێك جـار خوێـن لەئەندامێکی لاشە کۆدەبێتـەوە، کە ئـەو خوێنـە خەسـت بـووەو هیچ سوودێکی لە لەشدا نەماوە جگـە لـەزیان کـە ئەمـەش پێویستی بەکردنەدەرەوە هەیە، کـە بـەهۆی چـەند نەخۆشـییەکەوە یـا سروشـتی لـەش لەئـەندامی چـەند کـەس لەمرۆڤ پەیدادەبێت. جا یەکێك لـەو چارەسـەریانە کـە لەسـەردەمی پێغەمبـەر(د.خ) بـەکارهێنراوەو ئێسـتاش بـەرکاردەهێنرێت، بەتایبـەتی لـەناو کـوردەواری ئـەویش کەڵەشاخ گرتن (الحجامـة)ەیـە، کـە پێغەمبـەری خـوا(د.خ) زۆر بایەخی پێداوە.

کەڵەشاخ گرتن لەزمانەوانیدا واتـە:- المـداواة والمعالجـة بالمحجم. والمحجم الة الحجم[4]، ئامێرێکە وەکو پەرداخ وایە لە هـەوا بـەتاڵ دەکـرێ لەسـەر پێست دادەنرێ پاش ئەوەی کە برینـدار کـرا بـەهێزێکی زۆر خوێن رادەکێشی"[5].

لـەناو کوردەواریـدا قـۆچ (شـاخ)ی رەشـەوڵاخ بەکاردەهێنرا کەناوی کەڵەشاخ لەوەوەهاتووە، ئەویش بەمژینی کەڵەشـاخەکە تـاکو خوێنەکـە زیـاتر بێتـە دەرەوە، ئەمـەش پـاش ئـەوەی پێسـتەکە بـە مووس بریندار دەکرێ.

بـەکورتی: (کەڵەشـاخ گرتـن: کارێکـە بـۆ راکێشـانی خوێـن لەناوەوە بۆ دەرەوەی لەش، کە خوێنێکـی زیـادە لـە لـەش کـە دەبێتـە هـۆی ئـازارێکی زۆری ئەو ئەندامە یان هەڵئاوسانی).

پێغەمبـەر(د.خ) دەفـەرمووێ:- (ئەگـەر تینـی گـەرماتان زۆر بۆهـات، ئـەوە کەڵەشـاخ بگـرن بـا خوێـن لـە لەشـتان زیـاد نـەکات چونکـە دەتانکوژێت).

(عـن انـس(ر.ض) عنـه قـال، قـال رسـول الله(ص): اذا اشـتد الحر فاسعینوا بالحجامة لاتبلغ دم احدکم فیقتله)[6].

بەپێی فەرموودەیەك کە ئیمام (ترمذي) بەسەنەدی حەسەن لە عـەبدوڵلای دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر(د.خ) باسـی ئـەو شەوەی دەکرد کە بردبوویان بۆ ئیسـراو میعـراج فـەرمووی:



(لەلای هەر دەستەیێ فریشتە دەرۆیشتم دەیان فەرموو بەئوممەتت بڵێ کەڵەشاخ بگرن)[7].

ئەمەش فەرمانێکە لەلایەن فریشتەکانەوە بۆ سەر پێغەمبەر(د.خ) تا کەڵەشاخ بگرن کەبێگومان بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر سوودی کەڵەشاخ.

هەروەها فەرموودەیەکیش لەسەر کاتی گرتنی کەڵەشاخ هەیە کە دەفەرمووێ: (عن ابي هريرة(ر.ض) عن نبي(ص) قال: من احتجم لسبعة عشرة وتسع عشرة واحدى عشرين كان شفاء من كل داء)[8].

ئەو سوودە تەندروستیانەی لە کەڵەشاخ گرتنەوە پەیدادەبن[9] ئەمانەن :-

١-دەبێتە هۆی پاڵاوتن و خاوێن کردنەوەی خوێن و چالاك بوونی.

٢-نەرم کردنەوەی لولەکانی خوێن.

٣-بۆ باری تووش بوون بەتەنگەنەفەسی (رەبۆ).

٤-بۆ سەر ئێشەو شەقیقەو ددان ئێشان.

(سەلمای کارەکەری پێغەمبەر دەیگوت: هەر کەسێ لەلای پێغەمبەر(د.خ) سکاڵای حاڵی بکردایە لەدەست ژانەسەر دەیفەرموو: کەڵەشاخ بگرە)[10].

{ئیبنو عەبباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی پێغەمبەر(د.خ) لەئیحرامدابوو، کاتێ کەڵەشاخی لەسەری خۆی گرت، چونکە ژانە سەرێکی لەگەڵدابوو گەلێ جار لایێ لەسەری دەئێشا کە پێی دەگوترێت (شەقیقە)}[11].

٥-بۆ هەوکردنی منداڵدانی ئافرەت.

٦-لەکاتی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و رەق بوونی خوێنبەرەکان.

٧-بۆ تووش بوون بەرۆماتیزم.

٨-لەکاتی تووش بوون بە شان ئێشان و سینگ ئێشان.

٩-بۆ رۆشن کردنەوەی چاو.

بەڵگە: (عەکرەمە(خوا لێ رازی بێ) گوتی ئیبنو عەبباس(خوا لێ رازی بێ) سێ بەندەی هەبوون کەڵەشاخ گربوون، دوانیان بەکەڵەشاخ گری کەسابەتیان دەکردو پلەو پارەیان پەیدا دەکرد بۆ گوزەرانی خۆیان و خێزانیان، ئەوەکەی تریشیان کەڵەشاخ گری خۆیو خێزانی بوو.

گوتی: (ئیبنو عەبباس) گوتی : پێغەمبەری خودا(د.خ) دەیفەرموو: بەندەی کەڵەشاخ گر بەندەی چاکە هەم خوێنی پیس لادەباو هەم ژانی پشت سووك دەکاو هەم بەری چاو رۆشن دەکاتەوە..)[12] دووبارە ئیبنو عەبباس دەفەرمویێ: (كان رسول الله(ص) يحتجم ثلاثاً: واحدة على كاهله واثنين على الاخدعين)[13].

واتە: پێغەمبەر لەسەر سێ ئەندامی لەش کەڵەشاخی دەگرت یەکێکیان لەنێوان هەردوو شانەکانیو دوانەکەی تریش لەدوو رەگەکەی لامل کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (الاخدعان).

زانای گەورە ( ابن قیم)ی جوزی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: (کەڵەشاخ گرتن لەنێوان شانەکان بەسوودە بۆ ئازاری قورگ رووشان. هەروەها لەدوو رەگەکەی لامل بۆ نەخۆشییەکانی سەرو بەشەکانی وەك دەم و چاوو ددان و گوێو لووت و قورگ سوودی هەیە. ئەگەر روودانی ئەو نەخۆشیانە بەهۆی زۆری خوێن یان پیس بوونی خوێن بوو. هەروەها کەڵەشاخ گرتن



لەژێر چەناگە "الذقن" سوودی بۆ ددان ئێشان و روو هەیە، ئەگەر لەکاتی خۆی بەکار بێت)[١٤].

کە ئەمانەی سەرەوە نموونەی چەند فەرموودەو وتەی زانایان بوو کە زیاتر لە(١٥) فەرموودە لەسەر کەڵەشاخ هاتووە، بەڵام مشتێ لەمانە نموونەی خەرمانێکە.

ئێستا سەیر دەکەین کەڵەشاخ گرتن کەم بۆتەوە (لەکوردەواری هەر ماوەو زیندووە) کە پیشەو بەکارهاتووی باب و باپیرانمان بووە. بەهۆی پەیدابوونی خوێن بەخشین لەم چەرخە تازەدا کە بێگومان (خوێن بەخشین Transfusion) جۆرێکە لە کەڵەشاخ گرتن و سوودی تەندروستی زۆری هەیە لەرووی بەهێزیو لاشەو چالاکی لەکاتی خوێن بەخشین بەرێکخستن.

## پەراوێز:

١-رواه ابن ماجة واحمد والبزار في كتاب طب النبوي لابن القيم الجوزي ص٤٧.

٢-رواه البخاري ومسلم واخرجه ابو داود والترمذي وابن ماجة، مجلة التربية الاسلامية (٨).

٣-رواه البخاري ومسلم واخرجه النسائي واحمد، مجلة التربية الاسلامية (٨).

٤و٥-المنجد في اللغة (لويس معلوف)

٦-رواه الحاكم المسترك على الصحيحين ج٤/ ٢١٢ وقال الذهبي حديث صحيح. وفي الترغيب والترهيب.

٧-رواه الترمذي بسند حسن في كتاب التاج الجامع لاصول في احاديث الرسول.

٨-رواه ابو داود في (التاج).

٩-مجلة التربية الاسلامية العدد الثامن، السنة الثامنة والعشرون. شعبان ١٤٠٧ هجري.

١٠-رواه ابو داود في (التاج).

١١-رواه البخاري ومسلم والترمذي ونسائي في كتاب (التاج).

١٢-رواه الترمذي بسند حسن. في كتاب (التاج).

١٣-رواه البخاري ومسلم.

١٤-الطب النبوي (ابن القيم الجوزي) ص٥٣ في ١٩٨٨.

سوودم لەگۆڤاری {(التربية الاسلامية) العدد الثامن. شعبان ١٤٠٧ هجري} بابەتێکی (حازم ناظم فاضل) وەرگرتووە.



# بەرنامەی قورئانی پیرۆز... لەناو کتێبخانەی کۆمپیوتەردا



ئا/ کەوسەر جوامێر

هەڵبەت لێرەدا مەبەستمان لەکۆمپیوتەر نییە، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە کۆمپیوتەر یەکێکە لەهۆکارە هەرە پێشکەوتووەکانی سەردەم کە خزمەت بەمرۆڤ دەگەیەنێت و ئاستەنگەکانی ژیان لەبەردەمیدا ناهێڵێت و کارەکانی بۆ سانا دەکات. ئەمە پاش ئەوەی کارپێکردنی کۆمپیوتەر لەسەرەتادا تایبەت بوو بۆ جێبەجێ کردنی پرۆسەی ژمێریاری و ئەندازەیی، ئەوا ئەمرۆ بەتوانایەکی باڵاوە لەدەرگای بەشەکانی دیکەی رۆشنبیری‌و شیعرو رێزماندا دەدات. ئەگەر جاران کۆمپیوتەر تەنیا زمانی ئینگلیزی بەکار دەهێنا، ئەوا ئەمرۆ بەزمانەکانی دیکەی جیهانی‌و ناوخۆیی وەك چینی‌و عەرەبی‌و ژاپۆنی‌و کوردی‌و... هتد بەکاردەهێنرێت. واتە ئەمرۆ تەنیا لەلایەن ئەندازیارو بیرکاری زانەکانەوە بەکار ناهێنرێت، بەڵکو گەورەو بچووك، نووسەرو پزیشك... هتد بەکاری دەهێنن، ئەمەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە کۆمپیوتەر یەکێکە لەو هۆکارە هەرە بەسوودانەی کە لە هەموو رووێکەوە خزمەت بەمرۆڤ دەگەیەنێت... لەرووی ئایینییەوە سوودێکی زۆر لەکۆمپیوتەر کراوە، بەوەی کە بەرنامەیەکی تایبەت بەقورئانی پیرۆز بەناونیشانی (بەرنامەی قورئانی پیرۆز لەناو کتێبخانەی کۆمپیوتەر) بەشێوازێکی جوان و شایستە خراوەتە ناو کۆمپیوتەرەوە لەهەمان کاتدا بە گرنگترین دەستپێشخەری ئەو رێگایە دەژمێردرێت. بەرنامەی قورئانی پیرۆز بەو دەستکەوتە زانستییەو تەکنیکیە بەرزەوە زێتر لەدوو ساڵ و نیوی خایاندووە. شایانی ئاماژە پێکردنە نووسینی قورئان وەك باوە بە(رەسمی عوسمانی) بەپێی رێساکانی بەرزەفت و بزوێنەرەکان لەسەر زوومی کۆمپیوتەر بەشێوەیەکی شیاوو پوخت نیشان دەدرێت. هەڵبەت ئەمەش ئەرك و ماندووبوونێکی زۆری ویستووە. لیستە سەرەکییەکانی هەڵبژاردنی ئەو بەرنامەیە زۆر بەش دەگرێتە خۆ، لەوانە:-

١-نیشاندانی قورئانی پیرۆز لەسەر زوومی کۆمپیوتەر بەشێوەی نووسراوی (رەسمی عوسمانی): لەو بەشەدا دەتوانرێ هەر ئایەتێك یان هەر سورەتێکی قورئانی پیرۆز گەر بتەوێ بیدۆزیتەوە، ئەوا لەمیانەی پاڵەپەستۆ خستنە سەر (ماوس) بردنی نیشاندەرەکە بۆ سەر لیستە سەرەکییەکان، ماوەمان پێ دەدات بگەرێین بەناو ئایەت و سورەتەکاندا. ئەوکات بەشێوەیەکی خێراو بە زووترین کات دەیدۆزیتەوە. هەروەها لێرەدا



دەشێ هەر سورەتێك یان هەر بەشێك لەسەر كاغەز چاپی بكەیت ئەوا بەسانایی بۆت كۆپــی دەكـات. وێڕای ئەوەش ڕاڤەی وشە قورسەكان لەخوارووی زوومەكە نیشان دەدرێت.

٢-گەڕان بەدوای وشە: لەم بەشەدا دەكرێت لە هەر وشەیەك كە لـەقورئانی پـیرۆزدا هـاتبێت یـان لـەتێكڕای ئایەتـەكان هـاتبێت بگـەڕێیت. وێـڕای تەسـریفكردنی وشــە لــەرووی ڕێزمــانیو گــەڕان بــەدوای ماناكــان، پاشــان وشــەی داواكراوەكــە دەگەڕێنێتەوە بۆ بنچ و بنەوانەكەی. سورەتەكانی ئەم بەشە لـەوەدا بـەتێكڕایی ئـەو وشـانە ئـەژمار دەكــات جــا چ لەســەر ئاستی تێكڕای قورئـاندا یــان لەســەر ئاســتی ســورەت كــە لــەقورئانی پیرۆزدا هاتووە.



٣-گــەڕان بــەدوای پێگـەكانیان: ئـەم بەشـە بــەگرنگترین بەشــەكانی ئەو بەرنامەیە گوزارشت دەكرێت، چونكە لەڕێگەی ئەو بەشەوە دەتوانین تێكڕای ئەو شتانە بزانین كە لە قورئاندا هاتووە لەگەڵ تایبەتمـەندی هـەر شتێك كە دەربارەی هەر بابەتێكەوە هاتبێت، لەمبارەیـەوە تیمی كاركارانی ئەو بەرنامەیە بابەتەكانیان دابەش كردووە، كە لـەقورئاندا هـاتووە بۆ (٢٧٥) بابـەت و بەم شێوەیەی خوارەوە:-

١-(بیروباوەڕ): ئـەم بەشە بۆ (١٠١) بابـەتی لـق دابەش كراوە.

٢-(ئەحكامی فیقهی): ئەم بەشە بۆ (٧٩) بابەتی لق دابەش كراوە.

٣-ڕەوشــت و ڕەفتــارو نــەریت: ئەمــەش (٣٠) بابەتی لق لەخۆوە دەگرێت.

٤-ژیـانی پێغەمبـەران: (٦٥) بابـەتی لق لـەخۆوە دەگرێت.

٥-لەبـەر كردنـی قورئـانی پـیرۆز: هەڵبـەت ئـەو بەشە كۆمەكی ئەو كەسە دەكات كە كۆمپیوتەر بۆ لەبەر كردنی قورئانی پیرۆز بەكار دەهێنێـت. لـەم بەشەدا (٣) پلەی قورسی هەیە، جیاوازیش لەنێوان ئەو سێ پلەیەدا زێدەیی ژمارەی وشە شاراوەكانە كــە لەئایەتەكــەدا هــاتووە، بــەوەی كــە داوا لــە بەكارهێنــەری كۆمپیوتــەر بەشـێوەیەكی دروسـت بخاتە سەر زوومەكە.

٦-بەیاننامـەكانی قورئـان: ئـەم بەشـە (١٠) لـق و ئـەم بابەتانـەی خـوارەوە لەخۆوە دەگرێت:

ا- ناوەكــانی قورئــانی پیرۆزو ناوی سورەتەكان.

ب- مێـژووی نووسـینی قورئانەكە.

ج-ئایەتـەكانی مــەدەنی لــەناو ســـورەتەكانی مەككیداو بەپێچەوانەشەوە.

د- ژمارەی سورەتەكانی قورئان.

شـایانی باسـكردنە هەرچـەندە دەبێـت ئـەوەش بزانین كە ئێستا قورئانی پیرۆز بە (ئینتـەرنێت) بە جیهاندا بـڵاو دەكرێتــەوە، جـا لەبـەر ئـەوەی تـا رادەیـەك كـاركردن لەسـەر كۆمپیوتـەر و لـێزانینی لەناو كۆمەڵگاكەماندا تەواو پەرەی سەندووەو بۆتە كــارێكی ئاســایی، بۆیــە ویســتمان خوێنــەرانی بــەڕێزی خــۆری ئیسـلام بـەو زانیارییانـە ئاشـنا بكەین.

سەرچاوە/ گۆڤاری (العلوم) ژمارە ٣٧.





# لەدادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانەوە

ئا/ مافپەروەر: سیروان ئەحمەد

زنجیرە بڕیارێکی دادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانە، گۆڤارەکەمان لە هەموو ژمارەیەکیدا دوان لەو بڕیارانــە وەردەگێڕێتــە سـەر زمــانی کــوردی کــە پەیوەسـتن بەئـەوقاف و مەسـەلە شەرعییەکانەوە، ئەم کارەش هەنگاوێکی بەراییانەیە لەرێگەی بەکوردی کردنی یاسا.

١-دەستەی مــەدەنی تێهەڵچوونــەوەی دادگــای تەمییزی هەرێمی کوردستانی عێراق لەرێکــەوتی ٢٠٠١/٦/٢١ بەســەرۆکایەتی ســەرۆك بــەرێز (رەشـید عــەبدولقادر ســەلیم)و ئــەندامێتی هەریەك لە دادوەر بەرێزان (جەلال زیوەر عومەرو عەزیز عەبدوڵلا ئەحمــەدو د. محەممــەد عومــەر مەولودو ئەحمەد عەبدوڵلا زوبێر) پێك هات کــە رێیان پێدراوە بــەناوی گەلــەوە دادوەری بکــەن، ئەم بڕیارەیان دەرکرد :-

خــاوەن تــەمییز -تێهەڵچووەوە- لێنــا ڕازی کەســی دیکە/ش، سەرەڕای فەرمانبەرێتی.

تەمییز لەسەر کراوان:

١- تێهەڵچووەوە لە دژی ع ، سەرەڕای تەولیە.



٢- تێهەڵچوونەوە لەدژی - و ، سەرەرای فەرمانبەرێتی ٣- م

لێنــاڕازی کەســـی دیکـــە(ش) ســــەرەرای فەرمانبــەرێتی لای دادگــای بــەرایی هــەولێر بانگەشــەی ئــەوەی کـــرد کـــە لەرێکـــەوتی ٣٠/١٢/١٩٩٩ دادگای بەرایی دووەمی هــەولێر حوکمێکــــــی رووبــــــەڕوویی بـــــەژمارە ٩٣٠/ب٢/١٩٩٩ دەرکردووە کە زیــان و دەست درێــژی کردنــە بــەمافی (ش) تیــایدا قــەزاوەت دەکات بەدانەوەی موڵکی ٣٨٤/ بازاڕ بەداواکار (نــاڕازی لــەدژی یەکــەم) بــەبێ ئــەوەی خــاوەنی موڵکــی ٣٨٤/ بــازاڕ بێــت، کــە لەلایــەن (ش)ەوە خۆماڵە کراوە بەپێی ئــەو حوکمــەی لــەدادگای بـــەرایی هـــەولێر دەرچـــووە لەرێکـــەوتی ٤/٢/١٩٧٩، بــەژمارە ٣١٦/١٩٧٩و حوکمەکــە جێبــەجێ کــراوەو موڵکەکــە بــەناوی (ش)ەوە لەبەڕێوەبەرایەتی تۆمارگەی خانووبــەرە تۆمــار کــراوە بەهــەردوو ژمــارە ١١٨و ١١٩ مارســـی ١٩٨٣ تۆمــاری ٢٥٩ لــە ٤/٦/١٩٨٤. لەبەرئــەوە داوای کرد:

(١) دەرکردنـــی بڕیـــارێك بـــەراگرتنی ڕێو شــوێنی جێبــەجێ کــردن لەدۆســـیەی ژمــارە ٢٩٢/٢٠٠٠ تایبـــەت بەجێبـــەجێ کردنـــی حوکمەکــە کــە نــاڕازی لەســەر گــیراوە تاکــاتی ئـــەنجامی داواکـــەو ئاگـــادار کردنـــەوەی بەرێوەبەرایەتی جێبەجێ کردنی هەولێر پێی.

(٢) پوچەڵ کردنەوەی حوکمە ناڕازی لەسەر گیراوەکەو ڕەت کردنەوەی دەعوای داواکاریش.

(٣) پوچــەڵ کردنــەوەی قــەیدی ژمــارە ٤٣/ حوزەیــران بــۆ ســاڵی ١٩٩٩ کـــە بـــەگوێرەی موڵکەکە بەناوی موڵکدار تۆمارە بەپێی قەیدی پێشوو بەر لەخۆماڵە کردنەکە، چونکە قـەیدی ژمارە ١٢ ژمـارەی جلـد ١٤٥ بەرێکـەوتی ٩٦٣ لەسەر دووقـەیدی ١١٨و ١١٩ تۆمـاری ٢٥٩ لـە ٤/٦/١٩٨٤ جێگـــەیان گرتوەتـــەوە، هـــەموو قەیدێکی دواتر بۆ هــەردوو قــەیدی ١١٨و ١١٩ تۆماری ٢٥٩ کە بـەگوێرەیان موڵکەکـە بـەناوی (ش) تۆمــارە، پوچەڵــەو لەیاســادا ســـەنەدی نییـەو، لێنـاڕازی یەکـەم و دووەمیـش هـەموو خەرجییەکـــەیان بکەوێتـــە ئەســـتۆ. دادگـــای ناوبراو لەرێکەوتی ١/٦/٢٠٠١و، بەژمارە ٩٣٠/ لێنـــاڕازی کەســـی دیکـــە/ ٩٩٩ حوکمێکـــی رووبەڕوویی دەرکـرد کــە قابیلــە بــۆ تــەمییزو قــەزاوەت دەکــات بــەرەت کردنــەوەی لێنــاڕازی کەسی دیکەو پەسەند کردنی ئەو حوکمەی لەم دادگایــەوە دەرچــووە بەرێکــەوتی ٣٠/١٢/٩٩ لەگەڵ قبوڵ کردنی هــەردوو (تظلم)ی تایبــەت بەراگرتنی ڕێو شوێنەکان لەدۆسیەی جێبەجێ کردنی ٢٩٢/ن/٢٠٠٠ بەهەڵوەشاندنەوەی ئــەو بڕیــارەی لەلایــەن دادگـــاوە دراوە بەرێکـــەوتی ٢/٣/٢٠٠٠و ئاگادارکردنـەوەی بەڕێوەبەرایــەتی جێبـەجێ کردنی هـەولێر لێیو بـەردەوام بـوون لــەرێو شـــوێنەکانی جێبـــەجێ کردنـــی لـــەو خاڵــەوەی لێــی راوەســتاوە، دوای دەرچوونـــی حوکمەکــە بەپلــەی کۆتاییــەوە لەگــەڵ ئــەوەی لێناڕازی کەسـی دیکە خـەرجیو مـاندووبوونی پــارێزەری بکەوێتــە ئەســـتۆ بـــۆ بریکـــارانی لێناڕازی کەسانی دیکەو بـەبڕی (٦٠٠) دینـار بەیەکسـانی لـەنێوانیاندا. هەریەکـە لـەبریکاری لێنـــاڕازی کەســـی دیکـــە (ش) ســــەرەرای فەرمانبـەرێتیو لێنـاڕازی کەسـی دیکـە (م) لای دادگـــای تێهەڵچوونـــەوەی ناوچـــەی هـــەولێر



بەحوكمەكــەدا هەڵچوونــەوەو داوايــان كــرد هەڵبوەشێتەوە لەبەر ئەو هۆكارانەی لەعــەريزە تێهەڵچووەكــەياندا هـــاتووە لەرێكـــەوتی ٢٠٠٠/٦/٦و ٢٠٠٠/٧/١٧و دواتــر دادگـــای تێهەڵچوونــەوەی هــەولێر بريــاریدا يــەكيان بخــات و بەيـــەك شــێوە ســەيريان بكــات، لەرێكەوتی ٢٠٠١/٥/٨و بەژمارە ٤٦/س/٢٠٠٠ حوكمێكی رووبەڕوويی دەركـرد كـە قابيلـە بـۆ تەمييز كردنەوە كە قەزاوەت دەكات بەپشتگيری كردنی حوكمە بەراييەكە كـە لـەدەعوای ژمـارە ٩٣٠/ لێنـــاڕازی كەســـی ديكـــە/ ٩٩٩ لـــە ٢٠٠٠/٦/١ هـــاتووەو، لێنــاڕازی كەســی ديكــە (ش) هـــەموو خەرجييـــەك و مـــاندووبوونی پــارێزەری بكەوێتــە ئەســتۆ. لەبــەر ئــەوەی تێهەڵچووەوە/ لێناڕازی كەسـی ديكـە قەناعـەتی بەحوكمی ناوبراو نەهات لەرێگــەی تــەمييزەوە تانەی لێداو داوا دەكـات هەڵبوەشـێتەوە لەبـەر ئەو هۆكارانەی لەعەريزە تەمييزيەكەيدا هاتووە لەرێكـەوتی ٢٠٠١/٥/١٣ رەسمــی تەمييزيشـی دراوە لەگــەڵ پــاش بەندەكــەی لەرێكـــەوتی ٢٠٠١/١/١٨.

<u>بريـــار</u>

دوای وردكــاریو هەڵدانـــەوەی دۆســـيەكە دەركــەوت كەتانـــە تەمييزيەكـــە لـــەماوەی ياساييدايە، بۆيە لەرووی شێوازەوە قبوڵ كرا، دوابــەدوای تێڕوانينـــەوە بەحوكمــە تــەمييز كراوەكە كە قەزاوەت دەكات بەپشتگيری كردنی حوكمی بــەرايی ژمـارە ٩٣٠/ لێنـاڕازی كەسـی ديكە/٩٩٩ دەركەوت كە راستەو لەگەڵ ياسادا دەگونجێت، چونكـە لەگــەڵ بريــاری دەســتەی گشــتی ژمــارە ٤/دەســتەی گشــتی/٢٠٠٠ لــە ٢٠٠٠/٣/١ گونجاوە لەبەرئەوە بڕياردرا پەسەند بكرێــــت و ناڕازيــــە تەمييزيــــەكانيش رەت بكرێنەوەو بڕيارەكەش بەرێكەوتن دەرچوو لــە ٢٠٠١/٦/٢١.

**سەرۆك**

**رەشيد عەبدولقادر سەليم**

**٢-دەستەی باری كەســی لــەدادگای تــەمييزی هەرێمی كوردستانی عــێراق لەرێكــەوتی ٢٦/ذي الحجـــــة/ ١٤٢٠ ك بەرامبـــــــــەر ٢٠٠٠/٤/١ بەسەرۆكايەتی دادوەری (الاقدم) بەڕێز (جـەلال زيــوەر عومــەر)و، ئەندامـيـەتی هــەردوو دادوەر بەڕێزان (نازم موحەممەد ئەمين جەميل حەوێزیو ســەلاح ئەحمــەد يــەعقوبی) پێــك هـــات كـــە راسپێردراون بەناوی گەلەوە دادوەری بكــەن ئــەم بڕيارەيان دەركرد:-**

**خاوەن تەمييز- داوالێكراو/س**

**تەمييز لەسەركراو — داواكار/ ر**

بــەڕێز پــارێزەر (ك) لــەبريكاری داواكـــارو لەبــەردەم دادگـــای بـــاری كەســـی لەهـــەولێر بانگەشـەی ئـەوەی كـرد كـە داوالێكـراو مـێردی بريكاردەرەكەيـــەتیو، لەبەرئـــەوەی ژنەكـــەیو منداڵـەكانی هەريـــەك لـــە (ب.گ.م.ر)ی بـــەجێ هێشـــتووە بـــێ هيـــچ خەرجييـــەك لـــە (١٩٩٨/٨/١٥)ەوە تائێستا، بۆيە داوای كرد كە بانگ بكرێت بۆ دادبينیو پابەند بكرێت بەدانی خـــەرجی رابـــردوو بـــەردەوام لەگـــەڵ كەوتنـــە ئەســتۆی هــەموو خەرجييــەكيش. لەئــەنجامی دادبينييەكەو بەئامادە بوونی هەردوولاو دوای ئەوەی داواكار داواكەی لەخەرجی بەردەوامدا



هێشتەوە دادگای ناوبراو حوکمێکی بەئامادە بوونی هەردوولا دەرکرد لەرێکەوتی ١٩٩٩/٧/٦ کە پابەندی داوا لێکراو دەکات بەوەی خەرجییەکی مانگانە بەبڕی (١٥٠) دینار بدات بەژنەکەی هەروەها خەرجییەکی مانگانەش بەبڕی (١٠٠) دینار بۆ منداڵە ناکامە ناوبراوەکانی جگە لە (م) نەبێت. رێیداوە بەداواکار وەریبگرێت و بۆیان خەرج بکات ئەویش لەمێژووی بانگەشە کردنەوەکەوە لەرێکەوتی ١٩٩٨/١١/٢٥ وە داواکە رەت بکرێتەوە سەبارەت بەخەرجی رابردوو خەرجی (م)، چونکە تەمەنی کامڵ بوونی تێپەڕاندووە، خەرجیش خرایە ئەستۆی داواکارەوە بەماندوێتی پارێزەرایەتی بریکاری داواکاریشەوە کە دەکاتە (١٠٠) دینار، لەئەنجامی ئەو تانەیەی لەلایەن داوالێکراوەوە پێشکەش کرا، ئەم دادگایە بڕیاریدا حوکمە تەمییز کراوەکە هەڵبوەشێنێتەوە لەبەر ئەو هۆکارانەی لەبڕیارەکەدا هاتوون و، دۆسیەی دەعواکەش بگەڕێنرێتەوە بۆ دادگاکەی خۆی تا بەسەریدا بڕوات بەو شێوەیەی پێشتر هاتووە، بەمەرجێك رەسمە تەمییزیەکە بۆ ئەنجامەکەی بەجێ بهێڵرێت، دوای گەڕانەوەی دۆسیەی دەعواکە، دادگا سەر لەنوێ دادبینی تێدا کردەوەو دواتر حوکمێکی نوێی دەرکرد لەرێکەوتی ٢٠٠٠/٢/٢٩ کە داوالێکراو پابەند دەکات بەدانی (١٥٠) دینار بۆ داواکار سەبارەت بەخەرجی بەردەوامی هەروەها (١٠٠) دینار بۆ هەر یەك لە (ب.ه.گ.ر)و رێگەدان بەداواکار بەوەی وەریبگرێت و بۆیان خەرج بکات ئەویش لەرێکەوتی بانگەشە کردنەکەوە لە (١٩٩٨/١١/٢٥) وە داوای داواکار رەت بکرێتەوە سەبارەت بەخەرجی (م) و خەرجی رابردوو، خەرجیشی بکەوێتە ئەستۆ بەماندوێتی پارێزەرایەتی بریکاری داواکاریشەوە بەرێز پارێزەر (ك) کە (١٠٠) دینارە. لەبەر ئەوەی داوالێکراو قەناعەتی بەحوکمەکە نەهات لەرێی تەمییزەوە تانەی لێدا ئەویش بەلائیحەیەك لەرێکەوتی ٢٠٠١/٣/٦ هەروەها بریکاری داواکار لائیحەیەکی روون کردنەوەی لەهەمان رێکەوت پێشکەش کرد. دوای گەیشتنی دۆسیەی دەعواکە خرایە بەر باس و وردکارییەوە .

پاش وردبوونەوەو هەڵدانەوەی دۆسیەکە:

دەرکەوت کە تانە تەمییزیەکە لەماوەی یاساییدایە، بۆیە لەرووی شێوازەوە وەرگیرا، دوابەدوای تێڕوانینەوە بەحوکمە تەمییز کراوەکەدا دەرکەوت کەراستەو گونجاوە لەگەڵ حوکمی شەرع و یاسادا، چونکە بەپێی بڕیاری تەمییزی ژمارە ٩٩٩/١٤٧ لە ١٩٩٢/١٠/١٩ رۆیشتووە، لەبەر ئەوە بڕیاردرا پەسەند بکرێت و تانە تەمییزیەکانیش رەت بکرێنەوەو تەمییزکاریش رەسمە تەمییزیەکانی بکەوێتە ئەستۆ، بڕیارەکەش بەرێکەوتن لەرێکەوتی ٢٠٠٠/٤/١ دەرچوو.

**سەرۆك**

**جەلال زێوەر عومەر**



# چالاكییەكانی وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی

ئا/ ڕاگەیاندنی وەزارەت

**كۆبوونەوەیەكی هاوبەشی وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامیو یەكێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی كوردستان**

* لەرێكەوتی ٢٠٠١/٧/٣ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی سەرپەرشتی كۆبوونەوەیەكی هاوبەشی وەزارەتی ئەوقاف و مەكتەبی تەنفیزی یەكێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی كرد. لەكۆبوونەوەكەدا كە بەڕێزان خورشید شێرە بریكاری وەزارەت و مامۆستا مەلا محەممەد ئاكرەیی سەرۆكی یەكێتی زانایان ئامادەبوون دیراسەیەكی هاوبەش سەبارەت بەچەند تەوەرێكی پەیوەندیدار بەئایینی پیرۆزی ئیسلام كرا. سەبارەت بەخولەكانی ئەزبەركردنی قورئانی پیرۆز لیژنەیەكی هاوبەش لەوەزارەتی ئەوقاف و یەكێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی كوردستان پێكهێنرا، بڕیاریش درا لەئاییندەدا (٧٥) خولی ئەزبەركردنی قورئانی پیرۆز لەسەرجەم شارو شارۆچكەو گوندەكانی كوردستاندا بكرێتەوەو بەسەدان قوتابیو هاوولاتی موسڵمان دەتوانن تیایدا بەشداری بكەن،

هەروەها لەتەوەرێكی تردا بەڕێز وەزیری ئەوقاف جەختی لەسەر هاریكاری كردنی بەشی ڕاگەیاندنی یەكێتی زانایانی ئایینی كردەوەو بەڵێنی پێدان كە لەم بوارەدا هاوكاری تەواویان بكات و لەبەرنامەكانی ئایندەی خزمەتكردن بەپیاوانی ئایینیو مزگەوت و شوێنە پیرۆزەكان بیروڕایان لەگەڵدا بگۆڕێتەوە، سەرۆكی یەكێتی زانایانیش هەڵوێست و هاریكاری وەزارەتی ئەوقافی نرخاند.

**كردنەوەی هۆڵی بۆنە ئاینییەكان لەشارۆچكەی سەلاحەددین**

* لەرێكەوتی ٢٠٠١/٧/١١ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی پرۆژەی هۆڵی بۆنە ئاینییەكانی شارۆچكەی



بـــــــارزانی وەك دەســــــتورێکی کـــــــارپێکراو لەخزمـــــەتکردن بەخـەڵکی موسـڵمانی کوردســـــتان روون کـردەوە دووپاتیشـی کـردەوە کـە سـەرۆك (مەسعود بارزانی)یش بەئەمانەتـەوە هـەڵگری هـــەمان دروشـــم و ئالآیە، لەبەشێکی تری



ســەلاحەددینی کــردەوە کــە لەلایـەن وەزارەتـی ئەوقافـەوە بەنزیکـەی (١) ملیـۆن دینــار لەسـەر شێوازێکی ئـەندازیاری هاوچەرخانــە دروســتکراوە، لەرێورەسمی پرۆژەکـەدا بـەرێز مەسـعود سـاڵەیی ئـەندامی یـەدەکی کۆمیتــەی نـاوەندی پارتی دیموکراتـی کوردسـتان و خورشـید شـێرە بریکـــاری وەزارەتـی ئـەوقاف و بـەرپرس و نوێنـەرانی لیژنـەی ناوچـەکانی ســـەلآحەددین و بـــارزان و شـەقلاوەو سـەرۆك و ئـەندامانی شـــارەوانی ســـەلآحەددین و ســـــــکرتێری (ی.ل.د.ك) و ژمارەیـەکی زۆر لەمامۆسـتایانی ئایینیو جەماوەری شارۆچکەی ســەلاحەددین و دەوروبـــەری ئامــــادەبوون. ســــەرەتای رێورەسمەکە بەچەند ئایەتێك لە قورئانی پـیرۆز دەسـتی پێکـردو پاشــان وەســـتان و ســـورەتی فاتیحــە بـــۆ گیـــانی پـــاکی شـەهیدانی کـوردو کوردسـتان و سەروەریان (بارزانی نەمر و کاکە ئیدریســی هەمیشــە زینــدوو) دواتــر بـەرێز شـێخ عــەدنان نەقشـبەندی وەزیـری ئـەوقاف و کاروبـاری ئیســلامی وتــاری حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتانی پێشـکەش کـرد، کـە تیـایدا ســەرەرای گرنگـیو زەرورەتـی هۆڵێکـی بۆنـە ئایینییـەکان بـۆ شـــارۆچکەی ســـەلاحەددین ئامــاژەی بــەمێژووی پــارتی دیموکراتی کوردستان کـرد، کـە هــەر لــەرۆژی دامەزراندنییــەوە خزمـەتکردن بـەئایینی پـیرۆزی ئیسـلام و پیـــاوانی ئـــایینی لەئەولـەویاتی بەرنامــەو کـاری بــووە، پاشــان رۆڵ و رێبــازی وتارەکەیدا بـەرێز شـێخ عـەدنان نەقشـبەندی ئامــاژەی بــەکارو پرۆژەکانی وەزارەتـی ئـەوقاف و گرنگیدانــی بــەرێز (نێچیرڤــان بــارزانی) بــەپیاوانی ئــایینیو مزگـەوت و شـوێنە پیرۆزەکــان کرد، ئەمەش دەقەکەیەتی:

بسم الله الرحمن الرحيم

((وَقُلْ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ))

صدق الله العظيم

**بەرێزان ئـەندامانی سـەرکردایەتی پـارتی دیموکراتــی کوردســتانی تێکۆشەر**

**مامۆستایانی ئایینی بەقەدر.**

**تێکۆشــەرانی دەزگـــا حزبـــیو حکومیـــەکانی هاوینەهـــەواری ســەلاحەددین و بــەرێز خـــەلقی تێکۆشەری شارۆچکەی سەلاحەددینی بەرێز**



سڵاوی خواتـان لێبێـت و ئـەم کاتەتان باش.

جێگـای شـانازییە بـۆ مـن کـە لـەجیاتی رێـزدار سـەرۆکی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان کاک نێچیرڤان بارزانی هۆڵی بۆنە ئاینییـەکان لەهاوینەهـەواری سـەلاحەددین بکەینـەوە، وەکـو ئـەرکێکی پـیرۆزی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان بەگشـتی، وەزارەتـی ئـەوقاف وکاروبـاری ئیسلامی بەتایبەتی.

پاش ئـەو هـەموو کاولکارییـە کـە سـاڵانێکی دوورو درێـژو بەپێی بەرنامەیـەکی دارێـژراوی رەگەزپەرسـتی دژ بەمیللـەتی کورد کە پەیڕەوی لێ دەکرا.

**ئامـادەبوانی بـەڕێز و خۆشەویست:**

پارتی دیموکراتی کوردسـتان کـە رابەرایـەتی ئـەم تەجروبـە دیموکراتیـە بـێ وێنەیـە دەکـات لەهـەرێمی کوردسـتانی عـێراق لـەرۆژانی دامەزراندنییـەوە تائێسـتاش بـەوە ناسـراوە کـە هەردەم خزمـەتکردن و رێزگرتـن لـەئاینی پـیرۆزی ئیسـلام و پیـاوانی ئـاینی بەئـەرکێکی سەرەکی خۆی دانـاوەو، هـەموو کـاتێك ئـەندامان و لایـەنگران و دۆستانی خۆی بەوە پەروەردە و گـۆش کـردووەو ئێمـەمانانیش هـەموو کـاتێك کـە تـاکید لەسـەر رێبازی بارزانی دەکەینەوە وەکو دەسـتورێکی کارکردنمـان و سەرچاوەیەکی لە بن نەهاتوو بۆ هەڵسـووکەوتی رۆژانـەمان،و لەیەکێك لەبنـەما سـەرەکییەکانی ئەو رێبازە پیرۆزە خزمەت کردنە بـەئاینی پـیرۆزی ئیسـلام و فەلسەفە روون و رەواکەی لـەژێر رۆشـنایی فـەرموودەکانی پـەروەردگاری بێهاوتـا کـە لـەقورئانی پـیرۆزدا هـاتووەو فـەرموودەکانی پێغەمبـەری سەردارمان حەزرەتی (محەممـەد مسـتەفا)(د. خ)و لای هـەموو لایـەکمان ئاشکرایە کـە سـەرۆك مەسعود بارزانیش بەئەمانەتەوە هەڵگری ئەو ئاڵا پیرۆزەیـە دوور لەهەموو پڕوپاگەندەیەك.

**بـەڕێزان:**

کابینـەی چوارەمـی حکومـەتی هەرێمی کوردستان هـەر لـەرۆژی یەکـەمی پێکـهاتنی بەکابینـەی (سـەروەری یاسـا نـاوزەدکراوە) بـەڵام لای هـەموو لایـەکمان شاراوە نییە، کە سەروەری یاسا بەرقـەرار نـابێت و دادپـەروەری سـەقامگیر نـابێت گـەر نـەتوانین بەچاکترین شێوە خزمەت بەوڵات و گەلەکـەمان بکـەین، حکومـەتی هـەرێمیش لـەژێر رۆشـنایی ئامۆژگارییەکانی بەڕێز نێچیرڤان بـارزانی سـەرۆکی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان درێغـی نـەکردووە لەئـەنجام دانـی ئـەو ئەرکە پیرۆزەی سەر شانی، بۆیە دەبینـین دەسـتی خزمـەت و ئاوەدانکردنـەوە گەیشـتۆتە هـەموو شـارو شـارۆچکەکانی کوردسـتان و هـەر بـەردەوامیش دەبێت، هەر بۆ نمونەش ئەوەی پەیوەندی بەوەزارەتی ئەوقافەوە هـەبێت پـار سـاڵ (١٥) ملیـۆن دینـار لەبودجـەی حکومـەتی کوردسـتان سـەرف کـراوە، بـۆ ئەمسـاڵیش لـەحدودی (٣٨) ملیـۆن دینـار تـەرخان کـراوە لەبودجـەی وەزارەت و پـلان بـۆ ئەوەی بەچاکترین شێوە خزمەت بەمزگەوت و شوێنە ئاینییەکان بکرێـت، ئـەو پارەیـەش هـەموو لەبودجـەی حکومـەتی هـەرێم خـەرج دەکرێـت، چونکـە هـەموو لایەکمان ئاگادارین کە وەزارەتی ئـەوقاف وکاروبـاری ئیسـلامی لەبریاری ٩٨٦ بێبەشە.

**بـەڕێزان:**

لێرەدا شتێکیش هەیە جێگای خۆیـەتی کـە ئامـاژەی پێبکـەین ئـەویش ئەوەیـە کـە هـەر لـەدێر زەمانـەوە پەیوەندییـەکی سروشتیو خودا کردەیی هەبووە لەگەڵ ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بزوتنەوەی رزگاری خوازی گەلی



کوردی موسلّمان، مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە سەرکردەکانی شۆڕشە یەك لەدوایەکەکانی گەلەکەمان هەر لەشێخ عوبێدوڵلا نەهری تا شێخ سەعیدی پیران و شێخ عەبدولسەلام بارزانیو شێخ مەحمودی حەفیدو بارزانی نەمر هەر هەموویان پیاوانی ئایینی بوون و پەروەردەی مزگەوتەکان بوون.

ئەوانەی دەیانەوێت خزمەت بەئایینی پیرۆزی ئیسلام و میللەتەکەمان لێك جیا بکەنەوە لەحەقیقەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام تێنەگەیشتوون، چونکە راستییەکی سەلمێنراو هەیە کە (مرۆڤی ئایین پەروەر دەبێ نیشتمان پەروەریش بێت).

لەکۆتاییدا سڵاو بۆ گیانی پاکی شەهیدانی کوردستان و سەروەریان بارزانی نەمرو کاکە ئیدریسی هەمیشە لەیاد. چونکە ئەم هەموو دەسکەوتانە بەرهەمی خوێنی ئەوانە.

سڵاو لەپێشمەرگە قارەمانەکان، پاریزەرانی راستەقینەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و گەلە سەربەرزەکەمان. ئێوەش هەر شادو بەختەوەر بن.

والسلام علیکم ورحمە الله وبرکاتە.

## وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشوازی لەشاندێکی رێکخراوی بلاو کردنەوەی رۆشنبیری یاسایی دەکا

* لەرێکەوتی ٢٠٠١/٧/٢١ بەرێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لەدیوانی وەزارەت پێشوازی لەشاندێکی رێکخراوی بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری یاسایی کرد کە پێکهاتبوون لەبەرێزان: (پشتیوان سادق و سەردار عەزیز خۆشناوو خەدیجە سەبری ئاکرەییو جەمال ئەحمەد)، لەدیدارێکدا رێزگرتنی یاساو پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلەکەمان و راگرتنی پاك و خاوێنی شارەکانی کوردستانیان خستە بەردەم وەزیری ئەوقاف و داوایان کرد پیاوانی ئایینی ئیمام و خەتیبی مزگەوتەکان رۆڵی کاریگەرتر ببینن، بەرێز وەزیری ئەوقاف لەلای خۆیەوە بەڵێنی پێدان پێشنیارەکانیان بەهەند وەربگرێت و لەگەڵ وتاربێژو پیاوانی ئایینی کوردستاندا لایەنی پەیوەندار بەوەزارەتی ئەوقاف جێبەجێ بکات و هیوای سەرکەوتنی بۆ کارو بەرنامەکانی رێکخراوەکە خواست، شاندی میوان سەرەرای سوپاسگوزارییان بۆ هەڵوێستی وەزارەتی ئەوقاف، هەنگاوەکانی وەزارەتیان لەپێشەوەبردنی رەوشی ئایینی هەرێمی کوردستان شان بەشانی گرنگیدان بەبواری سیاسیو نیشتمانپەروەری بەرز نرخاند.

## وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشوازی لەمامۆستایانی ئاینی ئیسلامی پارێزگای سلێمانی دەکات

* لەرێکەوتی ٢٠٠١/٧/٣٠ بەرێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لە دیوانی وەزارەتدا پێشوازی کرد لە ژمارەیەك لە مامۆستایانی ئایینی پارێزگای سلێمانی، لە دیدارێکدا کە بەرێز مامۆستا مەلا رەسول بەرێوەبەری ئەوقافی سلێمانی ئامادە بوو، بەرێز وەزیری ئەوقاف گوێبیستی داواکاریو پێشنیازی مامۆستایانی ئایینی سلێمانی بوو، بەڵێنیدا بۆ باشکردنی گوزەران و جێگاو رێگایان، ئاسانکاریو هاوکاریان بکات، هەروەها ستایشی هەڵویستی خۆراگرو کوردپەروەر ئایینپەروەری ئەو مامۆستا بەرێزانەشی کرد کە لەپەیمانگای



پێشـنوێژو وتارخوێنـان وانـه دەڵێنەوە، لەكۆتایی دیدارەكـه بـەڕێز بەڕێوەبـەری ئـەوقافی سلێمانی سوپاس و پێزانینی پێشـكەش بەبـەڕێز وەزیـری ئەوقاف كـردو چـەندین كـاری خزمەتگوزاری وەزارەتی ئەوقاف و كاروبـاری ئیسـلامی بـۆ مامۆستایانی ئایینیو مزگـەوت و شوێنە ئایینییەكانی پارێزگای سلێمانی وەبیر هێنانەوە.

## وەزیری ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی پێشوازی لەبەڕێز (سید مستەفا خاتەمی )و شاندە یاوەرەكەی دەكات

* لەرێكـەوتی ٢٠٠١/٨/٥ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیـری ئـەوقاف وكاروبـاری ئیسـلامی پێشـوازی كـرد لەشـاندێكی كۆمـاری ئیسـلامی ئـێران بەسـەرۆكایەتی بـەڕێز (سـەید مسـتەفا خاتـەمی) ئـەندامی ئەنجومـەنی شـورای ئیسـلامیو ئیمـام و خـەتیبی شاری شنۆو ئەندامیەتی بەڕێزان (رەحیمـی شـەفیعی) ئـەندامی ئەنجومـەنی شـورای ئیسـلامی شاری شنۆو (كەیوان ئەشنوئیو عومـەرجان هشـان) كـه دوو بەرپرسـیو بـواری ئـابووریو بازرگانین، لەم دیدارەدا شاندی میوان مەبەستی سەردانەكەیان بۆ جەنابی وەزیر روون كردەوەو، بـەڕێز مامۆسـتا سـید مسـتەفا خاتـەمی، سـەرۆكی شـاندەكە گوتی:

خۆشـحاڵین بـەم بارودۆخـە ئارامـەی لەهـەرێمی كوردسـتان بەرقـەرارە، كۆمـاری ئیسـلامی وەزارەتی ئـەوقاف و كاروبـاری ئیسـلامی حكومـەتی هـەرێمی كوردسـتانمان پێدەگـات، هـەروەها لـەگۆڤار و بڵاوكـراوە ئیسـلامییەكانی وەزارەتـی ئـەوقاف بـەئاگاین و، چـەند ژمارەیەكی (خۆری ئیسلام)مـان لەلایە.

بـەڕێز مسـتەفا خاتـەمی



ئـێران بەبەرۆشـەوە دەڕوانێتـە پەیوەندییـە ئـابووریو كۆمەڵایەتییەكانی لەگەڵ هەرێمی كوردستان لەبواری خزمـەتكردن بەئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەڕێز خاتـەمی گوتـی: ئاوەدانییـەكی زۆرم لەمزگـەوت و شـوێنە پیرۆزەكـان بینـی. پیـاوانی ئـایینیو زانایـانی ئیسـلام دەتوانن بەشێوەیەكی كاریگـەر لـەبونیادنانی كۆمەڵگایـەكی مـەدەنیو ئاشتیخواز بەشـداری بكـەن. پـرۆژە و خزمەتـەكانی ئامـاژەی بـەزەرورەتی ئـاڵوگۆڕ كردنی پسپۆڕانی بواری ئایینیو كۆمەڵایـەتیو ئـابووری لـەنێوان حكومـەتی هـەرێمی كوردسـتان و كۆمـاری ئیسـلامی ئـێران كـردو باسـی لـەوە كـرد؛ كـە نیـاز وایـە لەسـەر سـنوور كۆمەڵگایـەكی بازاڕی ئازاد بكرێتـەوەو ڕێگـای ئـاڵوگۆڕی بازرگـانی لـەنێوان هـەرێمی كوردسـتان و كۆمـاری ئیسلامی ئێران فراوان بكرێت.

لـێرەدا هەریەكـە لەبـەڕێزان (كـەیوان ئەشنوئیو عومـەرجان



هشـــــان) چـــــــەند روونکردنەوەیــەکیان پێشـــکەش کــرد. دواتــر بــەڕێز (ڕەحیمــی شــەفیعی) ئــەندامی ئەنجومــەنی شــورای ئیســلامی شــاری شــنۆ ئاماژەی بەچەند پرۆژەو کارێکی کۆماری ئیسلامی ئێران کرد، کە بەنیازە لەشاری شنۆ بەئەنجام بگەیەنرێت وەك دروست کــردن و کردنەوەی پەیکــەرێکی گــەورەی شــەهید (عومــــەر خــاوەر) وەك ڕێزلێنــان بــۆ گیــانی پــاکی شـــــــەهیدانی کیمیابــــــارانی هەڵەبجــەی ســاڵی ١٩٨٨، کــە ژمارەیـــەك لەخانـــەوادەی ئـــەو شــەهیدانە روویــان لــەکۆماری ئیسلامی ئێران کـرد. هــەروەها باســی لــەپرۆژەی کردنـــەوەی دروستکردنی مزگەوتێکی گەورە لەشــاری شــنۆ کــرد بــەناوی (مزگــەوتی بــارزانی نــەمر) وەك ڕێزگرتن لەخانەوادەی بـارزانیو بارزانییـــــەکان، کـــە بـــەهۆی دەربەدەری بۆ ماوەیەك لەو شارە کوردپــــەروەرەدا ژیــــاون و، هەمیشە جێگای ڕێزو تــەقدیری دانیشتوانی ئەو شارە بوون.

هەروەها بەڕێز شەفیعی باسی لــەگرنگی حیــوارو گفتوگــۆی هێمنانــەی نێوان هــەردوو گــەلی کــوردو فــارس کــردو، ئامــاژەی بەسیاسەتی حەکیمانەی سەرۆك بـارزانی لــەم بارەیــەوە کــردو، ســـەردانی ڕێــزدار نێچیرڤـــان بـــارزانی ســـەرۆکی حکومـــەتی هــەرێمی کوردســتان بــۆ کۆمــاری ئیسلامی ئـێران بـەرز نرخـاندو، لەم بارەیەوە گوتی:

پێش ماوەیـەك، کـە جـەنابی کاك نێچیرڤان بارزانی سـەردانی کۆماری ئیسـلامی ئـێرانی کـرد، ئێمــە وەك ئەنجومـــەنی شـــورای ئیسلامی شاری شنۆ بەخزمـەتی گەیشتین و، داوامان لەبـەڕێزیان کرد لەگەڵ بەرپرسـانی کۆمـاری ئیسلامی ئـێران لـەبارەی نـۆژەن کردنـــەوە و دروســـت کردنـــی شـــــورایەکی شایســــــتە بـــــۆ گۆڕســـــــتانی شـــــــەهیدانی کوردســـــــتان و پێشــــــــمەرگە بارزانییـەکان کـە لەشـاری شـنۆ بــەخاك ســپێردراون، وتوویــــژ بکـات. دیـارە بەڕێزیشـیان ئـەم پێشنیارەی لەگــەڵ بەرپرســانی کۆمــــاری ئیســــلامی بـــاس کـردووەو، ئێسـتا ئێمـە سـەرقاڵی گرتنــــە بــــەری ڕێوشــــوێنی پێویســتین لەگــەڵ بەرپرســانی حکومــەتی هــەرێمی کوردســتان لەشــێوەی ئــەندازەیی هــەندێك لـــەو پرۆژانــــە پـــرس و ڕای پســپۆڕانی حکومــەتی هــەرێمی کوردســــــتان وەربگریــــــن، بەتایبــــــەتیش پســـــــپۆڕانی بیناسازی لەوەزارەتی ئـەوقاف و کاروباری ئیسلامی.

ئینجــا ســــەرۆکی شـــاندی کۆمـــاری ئیســـلامی ئـــێران داوەتنامەیەکی ئاراستەی بـەڕێز جــەنابی وەزیـــری ئـــەوقاف و کاروبــاری ئیســلامی کــرد بـــۆ ســـەردانی کۆمـــاری ئیســـلامی ئێران.

لەکۆتاییدا بەڕێز شێخ عەدنان نەقشـبەندی وەزیـری ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسـلامی دووپـاتی کردەوە، کە لـەژێر ڕێنماییەکانی ســـەرۆك بــــارزانی ســـــەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومـەتی هەرێمی کوردستان کارو پرۆژەی گـــەورەمان بـــۆ خزمــــەتکردن بــەپیاوانی ئــایینیو شــوێنە پیرۆزەکان بەدەستەوە. بەشاندی میوانیشـی ڕاگـەیاند کـە ئـایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ ڕزگار کردنی گەلانی ژێردەستەو زوڵم لێکـراو هاتووە هیچ گەلێك بەقەدەر گەلی کورد زوڵمی لێ نـەکراوە، کەواتـە شـــتێکی ئاســـاییە شـــانازی بــەئایینی پــیرۆزی ئیســلامەوە بکەین، لەبەشێکی تری وتەکەیدا بـۆ شــاندی میـــوان بـــەڕێزیان گوتی:

ئێمە وەك حکومـەتی هـەرێمی کوردستان هەمیشـە خوازیـاری پێکەوە ژیانی ئایینیو نەتەوەیی



بوویـــن، میـــژووی کـــوردو شۆڕشەکانمان شاهیدە، کە بۆ تەنها جارێکیش پەنامان بۆ چەك نەبردووە تەنها لەکاتی بەرگری کردن لەخۆمان و گەڕانەوەی مافە زەوتکراوەکانماندا نەبێت. خزمەتکردنیش بەئایینی پیرۆزی ئیسلام یەکێکە لەئەولەویاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان و لەخزمەتکردن بەپیاوانی ئایینی هەنگاوی بەرچاو نراوە. سەبارەت بەداوەتنامەکەش بەڕێز وەزیری ئەوقاف بەخۆشحاڵییەوە قبوڵی کردو هیوای بەسەر بردنی کاتێکی خۆشی لەهەرێمی کوردستان بۆ کردن.

## وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشوازی لەشاندێکی ڕێکخراوی MAG دەکات

* ڕێکەوتی ٢٠٠١/٨/٨ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لەدیوانی وەزارەتدا پێشوازی لەبەڕێزان (جۆن کلیکنی) بەڕێوەبەری بەرنامەی (MAG) لەکوردستان و د.ئاری حەسەن بەڕێوەبەری بەرنامەی هۆشیاری (مین) لەکوردستان کرد. سەرەتای دیدارەکە بەڕێز (جۆن کلیکنی) وەك بەڕێوەبەری تازەی ڕێکخراوەکەیان خۆی بەوەزیری ئەوقاف ناساندو داوای لێکرد وەزارەتی ئەوقاف هاوکاری ڕێکخراوەکانی (مین) هەڵگرتنەوە لەکوردستان بکات لەڕووی پێشکەش کردنی ڕێنمای بەمامۆستایانی ئایینی‌و پێش نوێژو وتارخوێنی مزگەوتەکانی کوردستان بەتایبەتیش لەشارۆچکەو گوندەکانی کوردستاندا، کە هەمیشە پیاوانی ئایینی‌و مامۆستای مزگەوتەکان مەرجەعیەتی ئایین و خەڵکی گوێ لەئامۆژگاری‌و ڕێنماییەکان دەگرێت، بەڕێز وەزیری ئەوقاف بەڵێنی پێدان کە هەر لەئەمڕۆوە ڕێنمایی دەدرێتە مامۆستاو پێش نوێژو وتارخوێنی هەموو مزگەوتەکانی کوردستان، تا لەڕووی هوشیار کردنەوەی گوندەکان بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ مینە چێندراوەکان و کێلگەو ناوچە مین ڕێژکراوەکان ڕۆڵی کاریگەر بگێڕن و لەمەترسییەکانی دەستکاری کردنی مین خەڵکی ئاگادار بکەنەوە. لەبەشێکی تری دیدارەکەدا وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی داوای کرد، لەپرۆسەی هەڵگرتنەوەو لەناوبردنی مین لەکوردستانی عێراقدا پەلە بکەن، لەکۆتاییدا هەردوولا سەرەڕای ستایشی هاوکاری وەزارەتی ئەوقاف بەڵێنیاندا بەباشترین شێوە کارەکانیان بەڕێوە ببەن.

## کردنەوەی مزگەوتی گەورەی ئازادی لە پارێزگای ئاکرێ

* ڕێکەوتی ٢٠٠١/٨/١٤ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پڕۆژەی مزگەوتی گەورەی ئازادی لەشاری ئاکرێ کردەوە کە بە نزیکەی یەك ملیۆن دینار لەلایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامییەوە دروست کراوە . لەڕێوڕەسمی کردنەوەی مزگەوتەکەدا کە هۆڵێکی بۆنە ئایینییەکان و خانوویەکی بۆ مامۆستای مزگەوتەکە لەخۆگرتووە چەند ئایەتێك لەقورئانی پیرۆز خوێندرایەوەو دەقیقەیەك وەستان بۆ گیانی پاکی شەهیدانی کوردو کوردستان سەروەریان بارزانی نەمرو کاك ئیدریسی هەمیشە زیندوو دەستی پێ کرد، پاشان وتەی بەخێرهێنان لەلایەن بەڕێز قایمقامی ئاکرێوە پێشکەش کرا. دواتر شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی وتارێکی پێشکەش کردو پڕۆژەکەی





بەدیارییەکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی ئەوقاف بۆ موسڵمانانی دەڤەری ئاکرێ لەقەڵەم دا کەسەرقاڵی پێشوازی کردنی شایستەن لەرۆژی ١٦ی ئاب دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان .

**ئەمەش دەقی وتارەکەیە :**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**﴿رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ* رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾**

**صدق الله العظيم**

سڵاوی خواتان لێ بێ. ئەم کاتەتان باش

**بەڕێزان مامۆستایانی ئایینی بەقەدرو ئازیز**

**خەڵکی شەرەفمەندو تێکۆشەری شاری ئاکرێی خۆشەویست**

خۆشحاڵم ئەمڕۆ لەشاری ئاکرێی خۆشەویستدا مەڵبەندێك لەمەڵبەندەکانی ئایین پەروەریو خودا ناسی بکەمەوە لەکاتێکدا کە ئێمە هەموو لایەکمان بەپیر یادی (٥٥) ساڵەی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە دەچین. ئەو پارتەی کە سەرکردەکەی (بارزانی نەمر) هەردەم ڕێزگرتن لەئایینی پیرۆزی ئیسلام و خزمەتکردن بەزانایانی بەڕێزی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لای ئەو زاتە مەزنە جێگای تایبەتی خۆی هەبووە.

**میوانانی بەڕێز، ئامادەبووانی ئازیز**

لای هەموو لایەکمان شاراوە نییەو ئاشکرایە کە میللەتی کورد لەو میللەتانە بووە کە لەدژوارترین کاتەکانی ژیانیدا کە زۆرن. هەردەم باوەڕی پتەوی بەوە بووە کە خودای پەروەردگار پشتیوانیەتی بۆ سەر خستنی بەسەر دوژمنان و ناحەزانیدا، لەگەڵ ئەم هەموو ستەم و زوڵمەی کە لێی کراوە، بڕوای بەوە هەبووە کە خواوەندی بێهاوتا پشتگیرو پەنای ئەو گەلە ستەم دیدە دەبێت. ئومێدەوارم ئەم مەڵبەندە کە جێگای عیبادەت و خودا ناسییە ببێتە مەڵبەندی وانە گوتنەوەی نیشتمان پەروەریو بەرگری لەمافی نەتەوەی کوردو ژیانێکی بەختەوەر بۆ کوردستانی خۆشەویست. بۆیە ڕووی دەمم دەکەمە ئێوە ئەی زانایانی ئایینیو مامۆستایانی بەقەدر تاکیدی ئەوە دەکەمەوە کە ئەوە ئەرکی سەرشانی ئێوەی بەڕێزە.

حکومەتی هەرێمی کوردستان لەرێگای وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی فەرمودەکانی سەرۆک



بارزانیو ئامۆژگارییەکانی بەڕێز نێچیرڤـان بـارزانی سـەرۆکی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان شـەرەفمەندە بـەوەی بەشـداری بکات بەپرۆژە جـۆراو جۆرەکـان لەئاوەدانکردنـەوەی کوردسـتانی خۆشەویسـتدا. ئاواتـە خوازیـن توانیبێتمـان و لەئایندەشـدا بتوانـین ئـەو ئەرکـە پـیرۆزەی سەرشـانمان بـەچاکترین شـێوە جیٚبەجیٚ بکەین.

لـەکۆتاییدا لـەخوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە کـە میللەتەکـەمان و هەرێمەکـەمان بپارێزێت لەهـەموو گـیروگرفت و ناخۆشـییەك و، پەناوپشـتی سەرکردایەتیمان بێـت بـۆ بـەدی هێنانی ئامانجی گەلەکـەمان کـە هـەزارەها شـەهید سـەربەرزانە خوێنـی خۆیـان بـەخت کـردووە لـەپێناو بـەدی هێنـانی ئـەم ئامانجە پیرۆزە.

واخر دعوانا ان الحمد للّه رب العالمين والصلاة والسلام على خير خلقه محمد عبده ورسوله ومن والاه الى يوم الدين. والسلام عليكم ورحمة اللّه وبركاته

## وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی سەرپەرشتی کۆبوونەوەیەك دەکات

* کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی رۆژی ١٦ی ئـابی ٢٠٠١ بـەڕێز شـێخ عـەدنان نەقشـبەندی وەزیـری ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسلامی بەئامادەبوونی بـەڕێز خورشـید شـێرە بریکـاری وەزارەت کۆبوونەوەیـەکی لەگـەڵ سـەرجەم کارمـەندانی وەزارەتـی ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسـلامی سـازدا. سـەرەتای کۆبوونەوەکـە بەڕێز وەزیری ئەوقاف پیرۆزبایی یـادی دامـەزراندنی پـارتی دیموکراتـی کوردسـتانی لەسـەرجەم کارمـەندانی وەزارەت و هـەموو گـەلی کـورد کـرد، پاشـان مێـژووی دامـەزراندنی پـارتی وەبـیر هێنانـەوەو چـەند لایـەنێك لەتایبەتمـەندی شۆڕشـگێرانەو نەتەوایـەتیو سیاسـی پـارتی دیموکراتـی کوردسـتانی لـەو سـەردەمەو ئێسـتاو ئـایندە خسـتە روو، لەوتارەکـەیدا کـە پێشـکەش بەکارمـەندانی وەزارەتـی کـرد بـەڕێز شـێخ عـەدنان نەقشـبەندی باسـی لەخواسـتی پـارتی دیموکراتـی کوردستان بۆ هـەنگاونان بـەرەو کۆمەلگایـەکی مـەدەنیو دیموکراسـیو خۆشـگوزەرانی کـردو ژیـانی موئەسەسـاتی بەیـەکێك لەئەولـەویاتی سـتراتیژیەتی نوێـی پـارتی لەقەڵەمدا.

هەر لەوتەکەیدا بەڕێزیان باسی لەحیکمـەت و هێمنـی سـەرۆك بارزانیو سـەرکردایەتی پـارتی دیموکراتـی کوردسـتان کـردو گوتـی: سـەرکردایەتی پـارتی بەشـانازییەوە بـەرگری لەپەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردسـتان دەکـات و فیدرالیـەتیش لـەعێراقێکی دیموکراسـیدا باشـترین چارەسـەرە بـۆ کێشـەی کـورد، هـەروەها رۆڵـی قارەمانانـەی پێشـمەرگەکانی کوردسـتانی وەبـیر هێنایـەوەو شـەهیدانی کوردستانی بەسـەرچاوەی ئـەم ئازادییەی ئەمڕۆ زانی. دواتریش بەڕێز خورشید شێرە بریکاری وەزارەتـی ئـەوقاف چـەند لایـەنێکی مێـژووی گرنگـی لەژیانی پارتیو شۆڕشی ئەیلول بـەرێنماییو سـەرکردایەتی بـارزانی نـەمر بـۆ کارمـەندانی وەزارەت روون کردەوە.





# بۆ هەر پرسیارێك وەڵامێك

ئێمە دەزانین زۆر کێشەی ئایینی و دەروونی و باوەڕ لە ڕێگەی پرسیارەوە چارەسەر دەکرێت، پرسیار کلیلی کردنەوەی گرێیە، پەندی کوردییە( پرسابە و دانابە ) و زۆربەی فەرمانەکانی خودا لە ئەنجامی پرسیاری یارانەوەبووە، دەیان ئایەت هەیە ( پرسیار دەکەن ) خودا بۆ خۆی لە زمانی قورئانەوە وەڵامی دەداتەوە، خۆری ئیسلام لە یەکەم ژمارەوە ئاواتی ئەوەبووە کە خوێنەرانی پرسیار بکەن و هەر گرێو کێشەیەکیان هەبێت لە ڕێگەی ئەم گۆشەوە بۆیان روون بکرێتەوە، هەندێ ژمارە لەبەر دووری ماوەی بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکە ( وەرزییە ) و بۆماوەی سێمانگ کە چارەکە ساڵێکە وەڵامی گەرما و گەرمی پێ نییە، لەبەرئەوە ئەگەر لەم ماوەیەدا پرسیارمان بۆ هاتبێت پشتگوێ نەخراوە، ئەگەر لە ژمارەیەکیشدا نەبووبێت پرسیار نەبووە.

خۆری ئیسلام

* خوێنەری بەڕێز هـ. ن پرسیار دەکات:

رای شەرع چۆنە لە بارەی ( جوانکاری ) رومەت و دەست و لەش؟

— ئێمە لەوەڵامدا بەم خوێنەرە دەڵێین ئیسلام جوانی لامەبەستەو هەولی پەرەسەندن و گەشەپێدانی دەدات بەهۆکاری یاسایی‌و ئاسایی‌و شەرعی‌و پەنابردن بۆ نۆژداری‌و کرداری جوان کردن بۆ ئافرەت و لەماڵی خۆیداو بۆ هاوسەری ژیانی خۆی‌و بەکارهێنانی دەرمانی بێ زیان و سروشتی کە بەتاقی کردنەوەی دەرکەوتبێ کە زیانی بۆ بەژن و بالاو پێست و مۆی جوانی نەبێت لەوانەش گیای سروشتی‌و پیشەسازی ئەوە حەلال و



موباحە، بەڵام لەئیسلام خاڵ کوتان قەدەغەیەو ئەگەر پێش باڵغ بوون بێت (دەست نوێژی دروست نییە)و لابردنی نینۆك و موی زیادەش لەدەم و چاوو بۆ ئافرەت دروستە، بەڵام بۆ پیاو ئەگەر تەنها بۆ جوانکاری بێت لەش زامدارکردن بەخاڵ و بۆیەو تاشینی ریش و هەڵکەندنی موی دەم و چاو سمێل و روومەت لەخانەی قەدەغە دایە بەتایبەتی دەسکاری روومەت و برۆو لەبارەی سمێڵەوە کەم کردنەوەی باشترە بۆ ئەوەی لەکاتی ناو خواردنەوەو شلەمەنیدا خۆی ئامانەکە شلوێ نەکات. لەفەرموودەیەکی راستدا هاتووە: {**نهى رسول الله عن النامصة والواشرة والواصلة والواشمة الامن داء**} کە مانای لابردنی مووو تاشینی روان و لکاندنی قژی لکاوو خاڵ کوتاندن دەگەیەنێ مەگەر لەبەر نەخۆشیو پاراستنی هەموو لەش و گیان بێت، لەهەمان کاتدا خزمەتکردنی ریش و بەپاکی چاودێری کردنی بۆ پیاو ئەرکی باوەڕدارە. چاك وایە لەسەرچاوەی فیقهی ئیسلام ئەم باسە زیاتر روون بکرێتەوە، چونکە راوبۆچوونی زۆری لەسەرە.

*** برای بەرێز س. ع پرسیار دەکات:**

**کابرایەك ئۆتۆمبیل یان ئامێرێکی کە بەکەسێکی دی داوە ئیشی پێبکات بەکرێو بریاری داوە کە بەقازانج بەرێژەیەکی دیاری کراو کاری لەسەر بکات ئایا ئەم (هاوبەشییە) شەرعیەو بەجێیە؟**

- (شەرکە) هاوبەشی شەرعی ئەوەیە کە پارە، ئامێر، کەل و پەل تێکەڵاو بێت و بەشی هەر لایەك لەقازانج و زیان بەرێژەی بەشدارییەکە بێت ئەو کاتە دروستە کە ئەوەش لەشەرعدا بە (شرکە العنان) ناسراوە، بەڵام ئەم شێوەی پرسیارەی برای بەرێز جیاوازی لەسەرە، شافعیو هاورازانی بەلایانەوە دروست نییە. حەسەنی بەسریو هاوبیرانی دەڵێن دروستە بەڵام پەسەند نییە، پێشەوا ئەحمەد لای وایە دروستە.

بەڵگەشی ئەوەیە ئەم ئۆتۆمبیلە یان ئەم دەزگایە، یان ئەو ئامێرە کە خاوەن پارە دەیکرێت و خەڵکی لەسەر دادەنێ ماڵەو زیادو کەم دەکات وەك باخەوان و جوتیاریو خزمەتکردنی درەخت و زەوی وایە. بەرای ئێمە بۆ چارەسەری ئەم پرسیارە رای پێشەوا ئەحمەد کاری پێبکرێ.

کابرای شوفێر، کرێکار لەقازانج شەریکەو لەزیان تەریکەو کارەکە دروستە. زانیاری تەواویش لای خودایە.

دوانکە

# بەڕێوەبردنی چاك پەرژینی ئەزموونی کوردە

مەلا عەبدوللەتیف باموٚکی

خودا ئەو جیهانی بوون و بوونەوەری بەیاسا دروست کردوە، خۆی خاوەنی کات و شوێن و بارە، دەیتوانی بە (کن فیکون) هەمووی دروست بکات، بەلام بۆ فێرکردن و رام کردن بە شەش رۆژ دروستی کرد، هەمووتاییە تمەندی و رەگەزەکانی تەبا و هاودژی پێکەوە گرێداوە، ئاو، ئاگر، تیشك، هەوا، خاك پێکەوە هەریەکە و کاروباری خۆی ئەنجام دەدا، ئەم بیردۆزە لە هەموو دیاردەکانی سروشتی رامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتی و ئایینی و کەسایەتی و خۆیەتی دێتە بەرچاو، تێکەلْ و پێکەلی تێدا نابێ، لە هەموویان رون و ئاشکراتر (کاری بەڕێوەبردن و کارگێڕی) کە جولەیەکی هونەریە، و لەهەموو ئەلقە و جمگە و بازنەکانی کۆمەلْ هەستی پێدەکرێ ئەگەر بەشەکانی هونەری شێوەکاری و وێنەکێشان و وێژە و زانستەکان پێویستی بەئاگاداری و شارەزایی و پاك بەڕێوەچوون هەبێت، خودی بەڕێوەبردن زیاتر پێویستی بە چاك ئەنجامدان و پاکی و دلسۆزی هەیە، پێغەمبەر ئەفەرموێ (د. خ) (رحم الله امرءً اذا عمل عملاً اتقنه) کە مانای راپەڕاندنی کارە بەچاکی و پاکی و بێ فێلْ و گەندەلی و کەم و کوڕی، ئەو هونەری بەڕێوەبردنە بەخشندە و دەهەندەی خودایە بۆ مرۆڤ و دەبێ پارێزگاری لێبکرێ دەنا خودا دەییاتەوە، هەر ناز و نیعمەتێ سوپاسی نەکرێ- کە پاراستن- سوپاسە کۆتایی دێت و لە دەست دەچێ ئەوە بەلێنی خودایە (إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ / الرعد/١١) ئەوەش دەگونجێ بۆ چاکە و خراپە، ناز و نیعمەت و دەسکەوت، نسکۆ و کارەسات و تەنگەژە و نەخۆشی و تەندروستی، تێری و برسیەتی ولاتانی رۆژئاوا لە سالانی ١٩٩٩ بڕیاریان دەرکردەوە کەسنورێك دابنێن بۆ گەندەلی، بەلام ئایینی ئیسلام پێش پازدە سەدە ئەو یاسایەی داناوە کە (من این لك هذا) و مەبەست پرسینەوە لە فەرمانڕەوا و کاربەدەست چۆن بەو شێوەیە سامانت کۆکردەوە پێغەمبەری سەرومر بەکاربەدەستەکەی گوت ئەگەر (دیارییە؟ بۆ لە مالی باوکت بۆیان نەهێناوی؟) ئەگەر ترسی پرسینەوە و گۆڕانکاری و بەسەر کردنەوە هەبێت دەبێتە بەرگری لە گەندەلی وێرای دەزگای لێ پرسینەوە وردبینی و بەکار هێنانی چاکسازی و نۆژەن کردنەوە و وەرگرتنی ئامارو تۆمار و تازەکردنەوەی هەلبژاردن و هەندێ لادانی ئەدەبی وەك بژار، گەشە، مۆلەت، خانەنشین و گەلێ زاراوەی تر کە ترسێك دروست دەکات لە دەروونی کاربەدەست بۆ چاکسازی و پاکتاوکردنی فەسادی ئیداری.

# شمس الإسلام

مجلة ثقافية علمية اسلامية، تصدرها وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية

السنة الرابعة العدد /١٣ جمادي الثاني ١٤٢٢هـ / ايلول ٢٠٠١ م



هۆڵی بۆنە ئاینیەکانی شارۆچکەی سەلاحەددین



وێنەی گوندی کەرەک / سیدەکان

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین / هەولێر

فۆتۆ : سامان بەشارەتی